نۆڤلێت



# بروسکەی سووم

محەمەد کەریم نانەوا

چاپی یەکەم
2010

لەبڵاوکراوەکانی سەنتەری لێکۆڵینەوەی فیکریی و ئەدەبی نما
زنجیرەی( ٩٤ )

سەرپەرشتیکردنی پرۆژەی چاپی کتێب
ئیسماعیل کوردە، ڕێبین رەسوڵ

ناوی کتێب بەکوردی: بروسکەی شووم
نووسەر: محەممەد کەریم نانەوا
ژانر: نۆڤلێت
دیزاین: نما
تیراژ: ٥٠٠
چاپ: چاپخانەی شەهاب
چاپی یەکەم: کوردستان/ هەولێر ٢٠١٠
نرخی: ٢٠٠٠ دینارە.


لەبەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانەکان ژمارە" ٩٧٥ "ی ساڵی ٢٠١٠ی پێسپێردراوە.

# بەرگۆڵ

لەم ساڵانەی دوایی لـە سـەرەتای هەشـتاکان لـە بەڕێوەبەرایـەتی ئاشـەکانی هەولێر فەرمانبەری حیسابگر بـووم، فەرمانبـەرێکی دڵـسۆزو چـالاك بـووم ..لـە کاتی ئیشکردندا قەت نەمدەهێشت یەك خولەك چییە بە فیڕۆ بـڕوات، ئیـشەکەی من زۆر ئاسان بوو، لەبەر ئەوەی وشکە ساڵی بوو، خاوەن ئـاژەڵ و مـەڕو مـاڵات دەبوایە هەیپای لێبکەن . بچن لە بەڕیوەبەرایەتی (بەیتەرە) ئیـسپاتی بکـەن کـە چەند سـەر مـەڕو بـزن و گۆلـك و گاڕەشـیان هەیـە، پـشتی هـەنگێ کارتیـان بـۆ چێدەکردن.. یەك تەن کەپەك، یان نیو تەن کەپەکیان بۆ دەنوسین . کە کارتەکەیان وەردەگرت وایاندەزانی کە ڕەگەزنامەی کوردستانییان پێ بەخشیون، بەهەڵە داوان دەهاتن بۆ لای ئێمە لە بەڕێوەبەرایەتی ئاشەکان، کارتەکەیان ڕادەستی لێپرساوی پرسگەی فەرمانگە دەکرد، کاکەی پرسـگە نووکـە قەلـەمێکی بـە کارتەکـە دادە هێنا پێی دەگووت: بڕۆ دوای پانزە (١٥) ڕۆژی دیکە سەر بدەوە،

.. لە ڕۆژی دیاریکراودا کابرا دەهاتەوە بۆ سـۆراخی کارتەکەی،!

.. کارت هێشتا لای جەنابی بەرێوەبەر زیندانییە واژوو نەکراوە، بە هەر حـاڵ دوای چـەند ڕۆژێکـی تـر، کـارت لـە بەندینخانـەی جـەنابی بەرێوەبـەر فـەرمانی ئـازادکرنی دەردەچـوو.. خـاوەن کـارت بەسـەر لێ شـێواوی گوێـچکی کارتەکـەی دەگرت دەهاتـە لای جـەنابم،، جـەنابم لـە دڵـسۆزی و پەرۆشـی خۆمـەوە بـە پێـی نیزامی (سرە) بەرێمدەکرد..

فلانی کوڕی فلان..؟! بەڵێ .

- دەبینە باوکی باوکم پارەی نیو تەن کەپەك بژمێرە .

- مامۆستا تۆ سەهووی ..یەك تەن کەپەکیان بۆم نوسیبوو.!

- کاکە ڕا ستەکەی، تەنێکیان بۆت نوسیبوو، بەلاّم جەنابی بەرێوەبـەر، لێـی کەم کردۆتەوە، لە دەسەلاتی مندا نیە.

..خەڵکی خاوەن مەڕو ماڵات،زاری گلەیی و گازاندەیان داپچڕی بوو، هەی وا هەرو بە ئاشکرا جنێویان دەدا .، بۆیە وامبەچاکزانی کە ئەم گلەیی گازاندانە بە جەنابی بەڕێوەبەر ڕابگەیەنم، بەڵکو ئەم گێرو گرفتانە لەبەین بەرین ..

ڕۆژێکیان هێشتا دەوام بەکۆتا نەهاتبوو، هەستام هندامی خۆم ڕێکخستەوە. هێدی هێدی ڕۆیشتم، چوم بۆ خزمەت جەنابی بەڕێوەبەر.. سلاوێکی قنجم لێکرد، پێموابی سەری ڕاهەژا ند.. دواتر بە نەرمە کۆخەیەك قورگی خۆم تەڕکردەوە گوتم:-

- مامۆستا ئەو خەڵکە زۆر بە گلەیی و گازاندەن، بڕوات بێ پیاوی وا هەیە سێ (٣) بەردە فڕێدەدا دەڵێ :

(ئەوە بیست (٢٠) ڕۆژە هاتوو چۆی فەرمانگەی بەیتەرە و ئەم دائیرەیە دەکەم، لە پاش ئەم هەمرو سەین و بەینە،

یەك تەن کەپەك، لێرەش تەنەکە (مزە) ی لێدەردەکرێ، دەمینێتەوەنیو تەن کەپەك).. جەنابی بەڕێوەبەر هەر خەریکی کاغەزەکانی بەردەمی بوو لە سەر مێزەکە، هەرگێڕو وەرگێڕی دەکردن،منگەی لێوەنەهات، هەروەك ئەوەی پێم بلێ (تەقەتەق تەرۆزی خۆشە).. ئەمجارەیان پێمگوت

- مامۆستا دەڵێم .. خاوەن ولسات و ئاژەڵدارەکان ڕاستەوخۆ هاموشۆی ئێمە بکەن چاتر نییە ..؟!

لەوەی بچن بۆ بەیتەرە، هەرنا ئێمە زوو بەرێیان دەکەین، ئەو سازمانی گلەیی و گازاندەیان نامێنێ .

جەنابیان زۆر بەتوندی گوتی : نەخێر. دواتر پرسی

- ئایا تۆ دەزانی هەر یەکێك لەو ئاژەڵدارانە، چەند سەر ئاژەڵیان هەیە ؟

- نەخێر قوربان نازانم .

- مادام نازانی پێتوایە گۆترەیە هەریەکێك بێت و (لۆری) یەك کەپەکی بدەینێ .!

-نەخێر مامۆستا، خۆ من ناڵێم لۆریەك کەپەکیان بدێ .. دەڵێم وا چاکە ئەم سەفاو مەروا یەیان پێ نەکەین .

گوتی: من نازانم کێ تۆی کردووه به فەرمانبەر..؟! پێدا چوو گوتی: (ئەوه چەندین ساڵه من بەڕێوەبەرم، فەرمانبەری وەکو تۆ گێل و گەلحۆ و هێرم نەدیوه.. دوا تر بە تەوسەوه گوتی ! ئەفەندی، ئەو ئاژەڵدارانەی جەنابت بوویتە خەم خۆریان، دەبێ ملیان بشکێنن، بە ملی شکاویان بڕۆن بۆ فەرمانگەی بەیتەره، لە وێنده‌ر ئیسپاتی بکەن کە چەند سەر مەڕو بزن و مانگاو گاو گۆلکیان هەیە بە دەفتەر، پاشان کارتێکیان بۆ بنوسن، ئێمەش بە گوێرەی کارتەکە کەپەکیان بۆ دەنووسین و بڕایەوه. کەپەکمان بۆ چییه..؟! خۆ خواردن نییە ئێمە بیخۆین، بانەوەشت پێبڵێم ..! جارێکی تر خۆت لەم جۆره کارانەدا هەڵمەقورتێنه، بە پێی کارتەکە چی تێدا نووسرابوو کاری بۆ بکە و تەواو، حەقت بەسەر هیچی تر نەبی . تێگەیشتی ..؟! لە تەشکی خۆم دا هاتمە دەرێ ..سێ .چوار ڕۆژ دوای ئەم مشتو مڕه . بۆ نەگبەتی خۆم کارتێکم بەرچاو کەوت خاوەنەکەی کوتاڵ فرۆش بوو، دوکانی لە ناو قەیسەری گەورەبوو، پێنج (٥) تەن کەپەکی بۆ نوسرابوو، کارتەکەم لای خۆم گلداوه، بۆ بەیانی کارتێکی دیکە هاتە بن دەستم، لە ناوەکەی وردبوومەوه..لەبەڵێ ناسیم، کابرا بەرگدروو‌بوو، هەشت (٨) تەن کەپەکیان بۆی نەسیبو.. لە دەبەنگی خۆم تێما بووم، دەمگوت : خۆ ئەم ئادەمیە ئاژەڵدارنیە، کەپەکی بۆ چییه ..؟!

..پێموابوو کە جەنابی بەڕێوەبەر ئاگای لەم تێکوتین و تێبڕینە نییە، سبەینێ زوو ڕۆیشتم بۆ لای جەنابی بەڕێوەبەر

کارتەکانم لەبەر دەمی جەنابیان دانا، گوتم :

- فەرمووو مامۆستا. خاوەنی ئەم کارتانە هیچیان ئاژەڵدار نین، مافی کەپەك وەرگرتنیان نییە.! گوتی :

- نازانم تۆ بەڕاستی گێلی، یان بەئەنقەست خۆت لە گێلی دەدەی.!

- بۆچی مامۆستا.؟!

باشە کێ ئەم کارتانەی هەناردووە بۆلای ئێمە.؟!

- بەڕێوەبەرایەتی بەیتەره قوربان .

- کەواتە ئیسپاتیان کردووه بۆمان، کە خاوەنی ئەم دوو کارتانە چەند سەر

گاو..گۆلك و.. مانگاو..جوانەگاو..  ڕەشەولاخی وەکو تۆیان هەیە، وانییە ئەفەندی.؟!

-- دیسان بەم سبەینە زووە لە تەشکی خۆم دا دەرچوومە دەرەوە،

.. وابوو تەرحیل و هیشکە سالّی لێکیان گرێدابۆوە، بازرگانی کەپەك بە هەرمێن کەوتبوو، وایلێهاتبوو هەرچی باشبازرگان و کوتالّ فرۆش و ئاغاو بە گلەرو پیاو ماقولّ و بەچکە شێخ و خاوەن تەکیەو کاربەدەستانی دەولّەت و ئافرەتی مەچەك پڕ لە بازنی زێڕو .. ئافرەتی وادەهات بۆ وەرگرتنی کەپەك بزن و تەگەی لێك جیا نەدەکردەوە، کەچی کارتێکی بەدەستەوە بوو، دە (١٠) تەن کەپەکی تیا نوسرابو، چییە ..؟ کەپەك قیمەت دەکات.. لەبەر ئەو قاچاخچیانە کەپەك وەبەر ئاژەلّدارەکان نەدەکەوت، کار بەوە گەیی بوو ئاژەلّدارەکان ناچاربوون بە چوار قیمەت پتر لە نرخی فەرمی کارتەکانیان لە بازرگانەکان دەکڕیەوە، ئەوجا ناوی پێیان دا دەچوڕا هەتاکو نۆرەیان دەگەیشتیێ..

.. لە بیێ هۆشی خۆم لە دەروونەوە نارەحەتبووم، خەمم دەخوارد، کەتبومە ژێرباری خەمان، ویژدانم تەنگی پێم هەلّچنی بوو حەجمانم نەبوو، بیرم لێکردەوە لە دلّی خۆم دا گووتم: (خۆ فەرمانگەو کەپەك مولّکی باوکی بەرێوەبەر نییە، مال، مالّی دەولّەتە و مولك مولّکی هەمووانە، دلّنیام لەوەی کە دەولّەت بێئاگایە لەم فڕکان فڕکانێ یە، واچاکە

لە بەڕێوەبەر بە سەرەوەتر ئاگادار بکەمەوە لەم گەندەلکاریەی لە ئارادایە..

.. لە کۆتایی دەوامی ئەو ڕۆژەدا بۆ ڕۆژی پاشی مادۆنیم وەرگرت، لە بەد بەختی خۆم بەیانی ڕۆژی ئایندە ڕۆیشتم بۆ (ئەمانەتی گشتی دارایی و ئابووری) لە نك سکرتێر ناوی نووسیم، چاوەڕوانبووم، کەنۆرەم هات، چوومە خزمەت جەنابی ئەمیندار، ئەوەی لە هەگبەم دابوولە بەردەمی بەرێزیان هەلّمڕشت، پێموابوو کارێکی پەسندو چاکو نیشتمانپەروەرانەو بوو جێ بەجێم کرد.. پاشان بە لە خۆ ڕازیبون و بە شانازییەوە، چەشنی سەرکردەکی سەربازی سەرکەوتوو لەجەنگ،قیت قیت بە سەر پێبلکەکاندا هێواش هێواش هاتمە خوارێ تۆ بلّیێ. هەروەکو دەلّێن :

(لەبێ خەبەران کەشکەك سەڵەوات).. تومەز جەنابم هێشتانەکێ نیوەی پێبلکەکانم نەبڕی بوو، بە تەلە فۆن جەنابی بەڕێوەبەریان ئاگادارکردبووەوە، بە دووزمان و ناپاك لەقەڵەمیان دابووم، بۆمیان تێکۆشی بوونەما تێکۆشین .. پشتی هنگێ دوای دوو رۆژ شاپێکی تەڕو تازەیان تێهەڵدام، فەرمانی گواستنەوەی ڕاژەم دەرچوو بوو بۆ بەغدا.. مووچەخۆری فەرمانە، دەبێ گوێڕایەڵی فەرمان بی .. تێمابووم . ئەگەر بڕۆم مووچەکەم تەنها بەشی خۆم و کرێی ئوتێل و چوون و هاتنم دەکات، ئەگەر ناڕۆم، ئەو چەند ساڵەی خوێندن و ڕاژە و ماندوو بوونم بە فیڕۆ دەڕوات، چار چییە ..؟! تێفکریم، بیرم لێکردەوە، دواجار بڕیارم دا نەڕۆم .. ئیدی کابرایەکی دەست و پێ سپی، چی لە دەست بێ تاوەکو پێوەی بژی ..!

# بەشی یەکەم

.. ئیتردوای نان بڕان، بە داماوی و سەرلێ شێواو، چەند ڕۆژان لەم شەقام و بۆ شەقام، بە هەرلایەکی دا دەسوڕامەوە سەرەنجام دەهاتمەوە پێش چایخانەی قەرداران .. ڕۆژێکیان لەم گەڕان و سوڕانەدا ڕووبەڕووی برادەرێك بووم، لەوەختی خۆی لە قوتابخانەی (سەیداوە) هاو پۆل بووین، دوای چاك و چۆنی بە سەر هاتی خۆم و کەپەکم بۆی گێڕاوە گوتم :

- هەنووکە بێ ئیشو کارم، بەدەست بەتاڵی دەسوڕێمەوە . برادەرەکەم تاوێ داما پاشان گوتی: " من لە شاری (نەینەوا) لە شەقامی (باب الگوب)ئوتێلەکم بەکرێ گرتووە، ئەگەر نارەزووت لێبێ وەرە لە ئوتێل لای من ئیش بکە.ناوی میوانان لە دەفتەری میوانداری تۆ مار بکە و سەرپەرشتی کرێکارەکانیش بکە، ئیدی پێکەوە دەخولێینەوە بزانین چارەنوس بە چی دەگات !

- من مەمنوون، لە مەچاترچی هەیە.

.. لەگەڵ برادەرەکەم وادەمان وابوو دوای دوو ڕۆژ سواری ئۆتۆمۆبیل بووین، نەینەوا خۆت بگرە وا هاتین .پاش نیوەڕۆ گەیشتینە مەنزل، ئوتێلەکە لە نهۆمی دووەمدا بوو، ژێرەوەی دوکان و بازاڕ بوو، بە قاندرمەکاندا سەرکەوتینە سەرەوە. هەر ئەم ئێوارەیە دەفتەری میوانداری پێ سپاردم ودەستبەکار بووم، کارێکی سادەوە ساکار بوو،کۆزو شەش بوو بۆ من..مرۆڤێکی لای خۆمان لە ژووری ژمارە (٣) دەخەوت، مرۆڤێکی بالاَ بەرز، ڕەشتاڵە، ڕدێن ماش و برنج بوو،نێوچەوانی لۆچی تێکەوتبوو پڕلۆچ بوو، یەك یەك لۆچەکانت بژماردایە هەرکەسێك بە دیقەتەوە سەرەنجی لێگرتبایە،بێگومان لێ حاڵی دەبوو، دەیزانی ڕۆژگار بەزم و ڕەزمی خۆی پێکردووە.. ئیدی ڕۆژ لەدوای ڕۆژ هاوڕێیەتیمان لەگەڵ ئەو مرۆڤە خۆشتر و بەتینتر دەبوو، هاوڕێیەتیەکەمان سروشتی بوو، چونکی بێگومان لە ئاوارەیی و دەربەدەریدا

کاتێ که دوو مرۆ سەر بەیەك هەرێم و یەك نەژاد بن، کە یەکدی گردەبن هەڵبەتە دۆستایەتی نێوانیان زۆر خۆش دەبێ، چوونکە (تەمەلا) سێبوریان پێکدێ .

.. هێواران کە هاورێکەم لە جگەرە فرۆشتن دەهاتەوە و دوای ئەوەی میوان دەکەوتنە پرخە پرخی خەوێ،هێتەرە کارەباییەکە (چا) یەکەمانی دێم دەدا، پێکەوە دادەنیشتین، هێدی هێدی دووکەڵی جگەرەمان بە (با) دەداو چایەمان فڕدەکرد، هەتاکو خەو بەسەرماندا زاڵ دەبوو قسەی خۆشمان دەکرد و پێش خەوتن هاورێکەم پێکێك عارەقی چێدەکرد فڕی دەکرد.. هەموو جارێکیش داوای لێبووردنی لە من دەکرد، چونکی من نەمدەخواردەوە، پاشان گڵۆپەکانمان دەکوژاندەوە لێدەخەوتین، زۆر جاری وا دەبوو لە کاتی سەر گەرمی دا هاورێکەم جزدانی پارەی لە گیرفانی دەردەهێنا، بە ئەسپایی واژی دەکردەوە، دەمدیت وێنەی ئافرەتێك و ئەفسەرێکی گەنجی تێدابوو، تاوێکی خۆش لێیان هورد دەبووەوە، فرمێسك بەسەر ڕوومەت و بەناو ڕیشی ماش و برنجی دا خلۆر دەبۆوە.. ئێوارەکیان لێم پرسی :

-ئەرێ کاکە حەمە، ئەم ئەفسەرە هاورێتە،خزمتە، چییە ؟

-لە ناخەوە ئاهێکی ساردی هەڵکێشا و گوتی:

- نەخێر کوڕمەوکوڕی تاقانەم بوو، ئافرەتەکەش دایکی بوو.

- کەواتە تۆ ژن و منداڵیشت هەن .؟!

- بەڵێ لە پێشدان هەمبوو، بەلاّم ئێستا سەڵتم.

- ببورە تێناگەم، ئەی چیان بەسەر هات .؟!

- کوڕەکەم کوشت و لە پاشان دایکی بەزگی دا لە حەژمەتان کۆچی دوایی کرد.

- ڕوونتر قسان بکە تێناگەم.!

- دەزانم تێناگەی، وەلێ ئارامت بێ، لە شەوانی ئایندە دا سەربردەی خۆمت بۆ دەگێرمەوە.

..ئیدی هەموو شەوێ دوای کپبوونی میوانان، دووقۆڵی دادەنیشتین و هەتاکو خەو بەسەرماندا زاڵ دەبوو، هەر شەوەی هەندێك لە بەسەرهات و ڕابردووی خۆی بۆم دەگێڕاوە.. هێندە بە تاموو چێژ دەیگێڕاوە هەر لە ڕۆمان دەچوو، بۆیە حەزمکرد هوردو و باریك، لە سیری هەتا پیوازی بۆ ئێوەی ئازیزو خۆشەویست بینوسمەوە.

## بەشی دووەم

.. گوتی : بیری منداڵی تیژە، بۆیە دێتەوە یادم تەمەنم لە دەوروبەری پێنج ..شەشساڵی دابوو. فەراقە بووم، یادی بەخێردایکم فەرمانی یەزدانی بەجێگەیاند کۆچی دوایی کرد، ماینەوە من و باوکم بێ کابان،کەسمان نەبوو بۆ بنەوانی بنەوانیمان بکات، ئێواران باوکم هەر بە خۆی هەندێك ڕوون و پیازی دەقرچاندەوە، گۆڵمەك ساواری لە چاوی دەکرد، هەر چۆنی هەبوو دەمانقەتاند.. پیرەژنەکەی هاوسێمان ناوە ناو شڕو شیتاڵ و پۆشاکی بەرمان، بۆمان لە ئاوێی وەردەدا دەیشووشت، دوو،سێ بەرە نانی مەزرەقەی بۆمان چێدەکرد، پشیەکمان بەم پیرەژنە خۆش بوو یارمەتی دەداین.. سێ .. چوار مانگ بەسەر مردنی دایکم دا تێپەڕی بوو، ماڵەکەمان تا بڵێی پیسو پەلۆخ بوو. بۆن ساردو گرخای لێدەهات، هەرکەسێك، هەرمیوانێك بەمیوانداری سەری بە ماڵەکەمان دابگرتایە، بێگومان دەیزانی کە ئەم ماڵە ئافرەتی تێدا نییە، بێ کابانە، بۆیە لە ژیاندا جێ دەستو پەنجەی ئافرەت لە ڕێکخستنی ناو ماڵ دیارە هەرگیز شوون بزر نابێت..

.. گوندەکەمان نزیکە شار بوو.باوکم لەم ماوەیەدا زوو، زوو دەچوو بۆ شار.. دوای نوێژی بەیانی دەڕۆیی، دەگەڵ بانگی ناوەند (عەسر) دەهاتەوە، ئێوارەیەکیان مام قادرو مام وسو، کە خەڵکی گوندی بوون هاتن بۆ لای باوکم دانیشتن خەریکی جگەرە پێچانەوە گفتوگۆ کردن و باسوخواسی دنیا بوون.. من سەرم دانابووە سەر ڕانی باوکم، بابم دەگەڵ قسە کردندا بەبێ ئاگایی دەستی لە کاکۆلم وەردەدا . پێم خۆش بوو لە خۆشیان خەو بە سەرمدا زاڵ بوو خەو چاوی گرتبووم دەبوورژام و بە ئاگا دەهاتمەوە، دیسان پێڵووم دەکەوتنە سەریەکدی دەبۆرژامەوە، بەلام کەم تازۆر بە دڵ هشیار بووم، گوێم لێبوو مام قادر گوتی :

- کاك ڕەزا بە خێرو سەلامەت کەنگێ زەماوەندکە ساز بکەین.؟!

.. لەگەڵ ئەم پرسیارە چاوم هەڵێنا دیتم زەردەخەنێکی شادمانی بەسەر قەیتانی لێوی بابم داهات. پاشان گووتی:

- لە هەفتەی ئایندەدا خۆتان ئامادەکەن بۆ کفتە خواردن.

.. لە قاقای پێکەنینیان دا، پاشان مام وسو گوتی :(یاڕەبی خودا مویارەکی بکات، ئیشەکی پیرۆزە چوونکی بێ بنەوانی و بێ کابانی زەحمەتە و دوژمنت لێی نەقەومێ باوکم و مام قادر گوتیان ! ئامین.

.. ئیدی لێرە بەدواوە من خەوم لێکەوت، نازانم تەگبیریان چبوو..؟! کەی ڕۆیشتنەوە نازانم. .بەیانی ڕۆژی ئایندە دەمەدەمی چێشتەنگاو کە چوومە دەرەوە بۆ یاریکردن لەگەڵ مندالآنی ئاوایی لە جێ جۆخینان یاریمان دەکرد.. سلۆی کوڕی مام قادر گوتی:

- ڕۆژی پێنج شەممە کفتەی دەخۆین.

مچەی عەلی کراشپان منداڵێکی لاسار بوو، جڕتێکی بۆ سلۆکێشا.. سلۆ باگۆی داوە گوتی:

-جڕت لە خۆت کوڕم. تۆ چووزانی ڕۆژی پێنج شەممە مام ڕەزا ژن دەگوازێتەوە بێگومان کفتەی دەخۆین،

.. ئیدی مندالەکان لە خۆشیان لە هەڵلاّیاندا ..! هێ یێ ی .. ئەوجا شەڕە کفتەی دەکەین. خەنیبوون لە خۆشیان.

.. وابوو ڕۆژی پێنج شەممە سەر لە سبیانێ ئافرەت و پیاوانی ئاوایی .کوڕە جحێڵ و کچە عازەب بە تایبەتی خۆیان تاس و لوس دابوو دەهاتن بۆ ماڵی ئێمە، ئافرەتەکان خەریکی ڕێکخستنەوەی ناو ماڵکەمان بوون، پیاوەکان دوو (گیسك) یان هێنا لە عاردیان داسەریان بڕین بە تەڕدەستی کەوڵیان کردن،پاشان بەتەور گۆشتەکەیان پەل پل کرد. ژنان سێکوچکەی ئاگردانیان دامەزراند، گۆشتەکەیان کردە ناو مەنجەلآن و ئاگردانیان ئاگردا.. مام قادرو مام وسو. وخالەوەسمان و چوار پێنج پیاوی دیکەو دوو ئافرەت لە پیرە (پەست) ی ڕەحمەتی(مەولودبزن) لێ سوار بوون بەڕێکەوتن بچن بووك بێنن..

دوای نوێژی عەسر خەڵکی ئاوایی هوردو درشت چاویان بڕیبووە ڕێگەی شار، ئێستا نا تاوێکی تر بەدەردەکەون دێنەوە.. من لەگەڵ منداڵانی ئاوایی یاریمان دەکرد،بەڵام نازانم بۆچی تێچاوێکم هەر لە باوکم بوو.. باوکم وەکو ئەوەی ژانی گرتبێت حەجمانی نەمابوو، دەهاتو دەچوو، سەردەکەوتە سەربانی خانوو، دواتر دادەبەزی، بەڵام ئۆقرەی نەدەگرت،دیسان بەسەر دەکەوتەوە، دەستی دەکردە چەپەرەی چاوی تەماشای ڕێگای شاری دەکرد، دواجار سەرکەوتەوە سەربان و دەنگی هەڵێنا گووتی: ئەو تۆزە ئەوانن واهاتنەوە.. هەرچی منداڵ بوو پێی پێوەنا بە غاردان شریتەیان بەست، منیش دوا بەدوای ئەوان هەیپام لێکرد بۆی دەرچووم، لە جێ خەرمان پێشمان لە پیرە پەستی مەولود بزن گرتەوە خۆمان پێوە شۆڕ کردەوە.. (هەرمەپرسە ئێمەی منداڵ لەو ڕۆژەدا چەند دڵخۆش بووین، لە چ خۆشیەکدا بووین . خۆشی ئەو خۆشی بوو ئێمەی تێدا بوو، هەتا ئەو ڕۆژەی دەمرم سەر دەنێمەوە هەرگیز ئەوەساتە خۆشانەی مناڵیم قەت لەیادم دەرناچن، ئەگەر چی ڕووت و قووت و قژ ئاڵۆسکاو پێخواس و جل شڕو پیس بووین، بەڵام دەروون پاکو بێگەرد و خاوێن بووین، ژەنگاوی نەبووین)

.. ئیدی بووکیان گەیاندە جێ دایانبەزاند، دوو ئافرەت لەملاو ئەو لای بن پیلی بووکەخانیان گرتبوو، هێدی هێدی دەڕۆیشتن .. دەتگووت لە سەر هێلکان دەڕۆن،هەتا بردیانە ژووری، پاشان کفتەو ترش تێکرا.. بخۆ دەی هەموو ڕۆژێ ئەو هارێك ناکەوێتەوە، هەتا هەنگڵمان ئێشا کفتەو ترشمان خوارد، پشتی هنگی شەڕە کفتە دەستی پێکرد..

(ئای چەند خۆشبوو، ماڵی وێرانم ڕۆیی بەسەرچوو، هەرگیز ناگەڕێتەوە)..

ئیدی پیاوەکان زوو پەرتەیان لێکرد، بەڵام هەتاکو بەرە بەری خۆر ئاوا بوون ماڵەکەمان پڕ بوون لە ژن و منداڵ .. منداڵەکان لە دەرگاو لە دەلاقەوە سەرە دیقانێیان لەگەڵ بووکە خان دەکرد، پیرەژنەکەی هاوسێمان، ئا ا.. وەبیرم هاتەوە ناوی پوورە (جەواهێر) بوو، بە پوورە (جەوە) بانگیان دەکرد، پوورە لەم سەرە تاتکێ و سەرە دیقانێیەی منداڵان توورە دەبوو، ختورمەکی بە دەستەوە گرتبوو ڕاوەدووی دەنان دەیگووت: (هەی دواتان بڕێ، تێرتان کفتە خوارد، دۆردڕا تەقەی

برِا بۆ نارِۆن.. تەماشای چی دەکەن، خۆ ئینسـان خۆر نییە).؟! بەڵام لە بن لێـوان دەگرژییەوە. : پاشان لۆم رِۆن بـۆوە، پـوورە جـەوە. بۆچـی دەگرژییـەوە و بـۆ چـی دەیگوت : خۆ ئینسان خۆر نییە .

.. ئیدی کە دنیا ئەنگۆرەبوو، تاریك داهات ژن و منداڵ پەیتا پەیتا پەرتەیان لێکرد چۆڵیان کرد،کەچی مـن. بەتـەنیا لـەم گـۆرِە مامـەوە، بـابم ئاگـای لـەمن برِابوو، خەریکبوو لە هارِژنی گریان بدەم، پوورە جەوە هات دەستی هاوێشتە ملم، ماچی کردم، دواتر دەستی گرتم بردمی بۆماڵی خۆیان..

## بەشی سێیەم

..سبیانەکی زوو،دوو هەفتە بەسەر زەماوەندی باوکم و بووکەخانی زڕدایکم دا تێپەڕی بوو،دوای قاوەڵتی باوکم پێی گوتم:-

(کوڕم حەمە، من و دایکت بۆ هەندێك کاری پێویست دەچین بۆ شار، هەڵە پاسی مەکە، کە هێواریێ هاتینەوە حەلواو کولێرە بە کونجی بۆ کوڕی خۆم دێنم باشە کوڕم) .

.. پاشان بەڕێ کەوتن ڕۆیشتن .. هێواریێ کە هاتنەوە ببوون بە چوار، دوو منداڵیان لەگەڵ دابوو، هەردووکیان کچ بوون، لە من بە تەمەن تر بوون، سەرم سوڕمابوو دەبێ ئەم منداڵانە کێ بن..؟!

دیاربوو باوکم زوو هەستی بە سەر سووڕمان و نیگەرانی من کردبوو، هەستا چووە دەرێ پاشان بانگی کردم، کاوەرە دەرێ ئیشم پێتە.! ڕابوومە سەرپێ لەبەر دەمی ڕاوەستام، پرسی گوتی!

- دەزانی ئەم منداڵانە کێن.؟!

- نەخێر چووزانم کێن.!

پێکەنی، گووتی:

- چۆن نازانی..ئەوانە خوشکتن، حاڵی بووی .؟!

-بابە من کوا خوشکم هەیە .؟!

- گرنگ نییە، ئێستا ئەم دوو کیژۆڵەیە خوشکتن، تێگەیشتی.؟!

-سەری ڕەزامەندیم بۆی لەقاند، بەڵێ تێگەیشتم.

(ئەلێرە تاوێ پێکەنی، دواتر تێهەڵچووە گوتی!

-هێشتا دوومانگ بەسەر زەماوەندیان تێنەپەڕی بوو،ڕۆژێکیان لە پەڕگەی ئاوایی لەگەڵ منداڵان یاریمان دەکرد دیتمان.. کوڕە جحێلەکی دوانزە .. سیانزە ساڵان و ئافرەتێکی شۆخ و شەنگ دەستی منداڵێکی گرتبوو، منداڵەکیشی لە

باوەش بوو، یاغر یاغر بەرەو ئاوایی دەهاتن، وازمان لە یاریکردن هێنا چاوەڕوان بووین، کوڕە گەنجە هاتەپێش پرسی گوونی :

- منداڵینە،کیهە ماڵی مام ڕەزایە.؟!

..منداڵەکان هەندێکیان بەدەست ئامـاژەی مـاڵی ئێمـە یـان نیـشاندا، یـەك دووانێکیان گوتیان، ئەوە..واتا (من) حەمەی مام ڕەزایە.

.. ئیدی وەپێشیان کەوتم بۆ ماڵ، هەر کە لـە کۆسـپەی دەرگـای حەوشـە بـە ژوورکەوتین، زڕدایکم بـە پیریانـەوە هـات هـەردوو دەسـتی هاویـشتە ملـی کـوڕە جحێڵکە و ماچی کرد، ئەوجا لەگەڵ ئافرەتەکە ئاوێزان بـوون یەکـدیان لێـستەوە، دواجار هـەردوو منداڵەکانیـشی مـاچ کرد،پاشـان ڕووی بـەلای منـدا وەرچـەخاند گوتی.. (کوڕم حەمە بەغار بـڕۆ بـانگی باوکـت بکـەوە. لـەدیوەخان پێـی بڵـێ : دایکم گوتی بێتەوە میوانمان هاتوون.)

..هەندەی بلێی یەکودوو خۆم گەیاندە دیوەخان بە هەناسەبڕکێ ! گووتم: بابـە وەرە بابچینەوە میوانمان هاتوون، بە جووتە گەڕاینەوە، هێـشتا پێیـەکم لـەو دیـو کۆسپەی دەرگای حەوشە بوو زڕدایکم دەنگی دام گوتی:

(حەمە بڕۆ دوو بارۆکـە بگـرە، هـەتا زووە سـەریان بـبڕین).بـە یـەکتاو خـۆم گەیانـدە سـەر گوفـەك دوو باڕۆکـەم قیڕەبـڕ کـرد، بـاوکم سـەری بـڕین، زڕدایکـم بەتەڕدەستی ئاوە ڕووتی کردن، ئیدی سەرت نێشێنم وبـەبێ تـۆ نـاخۆش هێـوارێ لێماندا لە شلەی ساوار بە گۆشت فرۆج.. ئای کـە بـەتام و لـەزەت و خـۆش بـوو، دوابەدوای نانخواردن بەدەم شەو چەرە خواردن سەرگەرمی گفتوگۆبوون، بـەلام مـن سەرم لە گفتوگۆیان دەرنەدەچوو،تێامابووم .. بابم بە کچم..کـچم و کـوڕم..کـوڕم دەیدواندن، ئەوانیش بە بەڵێ باوکە گیان وەرامیان دەداوە

بەلام بۆم دەرکەوت کە ئەوانە خوشك و بران کیژو کوڕی زردایکمـن، ئافرەتـە شۆخەکە گلەیی و گازاندەی لە مێردەکەی خۆی دەکرد لـەلای بـاوکم، بـەوەی کـە هەڵسوکەوتی مێردەکەی باش نیە لەگەڵی، داوای لـە بـابم کـرد بـەڵکو چـاوی لێ سوور بکاتەوە تەمبێی بکات.. لەم قسانە لێ حاڵی بووم زانیم زیز بووە هاتۆتەوە بۆ ماڵە باوی، زڕدایکم دەیگوت، (کیژم خەمێ مـەخۆ، خـۆ مـاڵی باوکـت کـاول

نەبووە، پارچە نانێك هەردەبێ بیخۆی، دانیشە سەگبابی وا بـا هەرلـەوێ بنـاری، هەتا ڕۆشنای چاوی دەڕژێتەبنی پێی.

..دوای سێ..چوارڕۆژ، ڕۆژێکیان مێردەکەی بە شوێن ژنەکەی داهات . بەهەر حاڵی هەبوو لەگەڵ خۆی بردیەوە. بەڵام..! زرڕدایکم دکرێکی وای پێکـرد هـەرگیز لە باسکردن نایەت، ئەسڵەن بـە (ئاتـە دۆم) نـەکراوە.. ئـەوە دامـاوە سـەری لێ شێوابوو،خەسوو بە سەریدا دەیشیراند، کـچ، بـاگۆی دەداوە، لەهـەمووی سـەیرتر باوکم بوو،ناوە ناو سەرکۆنەی دەکرد، ئەو بـە لـەنگازە دەیویسـت ڕزگـاری بـی لـە زمانیان، بۆیە سەری زمانی و بنی زمانی هەرئەوە بوو دەیگووت: بەڵێ مامۆژن، بەسەر چاو، خەمت نەبێ، بەشاهێدی مام ڕەزا، لە گوڵ گرانتری پێنـاڵیم و ئەگـەر جارەکی دیکە عێدزم کرد ملم لە موودك باریکترە.

## بەشی چوارەم

بالێرەدا کەمێك باسی زڕدایکم بکەم.. زڕدایکم ئافرەتێکی بالآبەرز، ڕەق و هیشك، میسری کۆشت بوو دەتگوت: سیرمەی دۆمانە، لووت باریك و درێژ قەرانگەی کردبوو، دووچاوی سپی واژ، دەستو کلچووکی هەردەم لەشەڕدا بوو،

دوو بسکی ڕەشی قەترانی لەخەنەو، وەسمەی دەگرتن، تا بلّی دل تەڕو بەنازو فیز بوو، ئەگەر چی بەتەمەن گەورە بوو، بەلاّم خۆی وانیشان نەدەدا کە بەناو سالّدا کەوتووە، لە ئەدکارو ڕەوشت و سەرو سیما و ڕوخساری دا ئاشکرا بوو کە خەمی دونیای هەلّنەگرتبوو، لە کێندەر لێی پسابوو، هەر لەوێ لێکی گرێنەدابوو بە جێی هێشتبوو ئاوڕی لێنەدابۆوە، لە ژیاندا هیچی لە پاشۆلّی نەکردبوو، وەکو مانگای چێلّس و بۆگە خۆر هەر هەریلووشی بوو، لە سەر ئەم حالّەشەوە جگەرە کێش بوو، ددانەکانی هەندێکیان زەرد هەلّگەڕا بوون، کاتێ کە پێدەکەنی ناو دەمی وەکو کونە ڕەنگارە ئاسای ڕەش دەچۆوە..ئەو زڕدایکەم، نەخێر، واچاکەبلّێم: کەلە کەوێتی تەڕپیر،

..کەلەکەوێت دووسواری گلاّندبوو، باوکم سێیەم بوو ئەوسا بەسەرپشتیەوە، جارێ وای دەهێناو دەبرد تەڕادانێی پێدەکرد.نەمدەزانی چارەنووسی باوکم بەچی دەگات..؟!

کەلەکەوێت نەخێر چاکتر وایە بلّێم: (تەڕپیر)، پێموایە کە ئەم ناوەی جوانتر لێدێ .. تەڕپیرلە مێردی یەکەمی کوڕە جحێلّەکەو ئافرەتە شۆخوکەی لێ هەبوو لە مێردی دووەمی ئەو دوو کچۆلّەی هەبوو ..(ئەدی کاکێ. ئەگەر خوا بیدات بە خۆشت نازانی چۆن دەیدات، لەوە چاکتر چ هەیە..؟! مانگا بەخۆیی و بە دوو سەنگۆوە بێتە بەر دەرکەی مالّت، ئێوە بلّێن چتۆ نیعمەتە)

..ئێستاش بیری لێ دەکەمەوە نازانم، ئەو زڕدایکەم بۆ چی هێندەدلّڕەق بوو

بەرانبەر بە من.. لە ترسی ئەو نەفرەتیە نەدەوێرام لە پێستەی خۆمدا بجوولێمەوە. هێندە ڕەقەکار بوو مەپرسە، ئەگەر شتێك بە دڵی نەبوایە، بەچەپەلۆکان دایدەپەلۆسیم جاری وا هەبوو لەگەڵ کچەتیمەکانی دەبووە دەمەقاڵێمان، ئەو خودا نەناسە شێت و هار دەبوو، هەمووجاری یەك پاشۆڵ پڕ بە پاشۆڵی خۆی گلەیی و گازاندەی لە بەر دەمی بابم هەڵدەڕشت دەیگوت: دەغەزاری کردووم، دانا کەسێ . ..ئەم دوو کیژۆرۆکەی کوشتووە، ناوێرن سەر دەرێنن بڵێن:لەل.. بە شەق و پێلەقە دەکەوێتە وێزەیان مارکوژیان دەکات.چیە ئەوە ئیسراحەتی لێ هەڵگرتووین، ئیدی نەیدەبڕیەوە.

..بابم پیاوێکی کلۆڵ بوو لەسەر قسەی تەڕیر، دایدەپەلۆسیم.وەبەر شەق و پێلەقەی دەدام، لە هەمووی ناخۆشتر لەو کاتەدا ئەوە بوو ..! کچە تیوەکان پێم پێدەکەنین،بۆیە لە حەژمەتان هەتا شل دەبووم دەگریام و دەنوزامەوە، بەڵام گریان و نوزانەوە، بەچی دەچی.. کەسێك نەبوو بەزەیی پێمدا بێتەوە نازم هەڵگرێ، بێجگە لە پورە جەوە .. جاری وابوو پێدەحەسیا، دەهات دەستی دەهاوێتە ملم، ئەملاو ئەولا ڕوومەتی دەسڕیەوە ماچی دەکردم.دەستی دەگرتم دەیبردمەوە

ماڵی خۆیان، دیگوت: (ئەو جادووکەرە،جادووی لەم پیاوە کردووە، قوڕی بەدەمی داداوە، ناڵێ..! کچێ ئافرەت ئەوە تفارۆکە گوناحی چییە..؟! دەلەقوڕی تێهەڵدرای مەگەر دایکە ناوگەڵ تەڕەکەی، هەرئەو بەخۆی بزانێ لەکامە سەگسار فاڵی خواردووە...؟! لە پشکە ئاوی ئەم سەگسار ئەم دەلەقوڕەی لێ وەپاشکەوتووە، ئیشەڵلا بەسەرو پرچی سپی ڕەدوو دەکەوی قژی دێتە برین.. دەککە هەردوو چاوت کوێرەبی ڕەزا، کوو..؟! لەدڵت دێ پشت بکەیتە ئەم منداڵە خۆ زڕ نییە..؟! گریمان زڕبوو گوناحی چییە.)

.. پوورە جەوە، بەم قسانە دەیلاواندمەوە دڵی دەدامەوە، نانی دەرخوارد دەدام. زۆر جاری وادەبوو هەر لە ماڵی پوورە جەوە کپ خەوم لێدەکەوت.. ئێستەش جاروبار کاتێ کە بیردەکەمەوە نازانم ئەو زڕدایکەم بۆچی..؟! هێندە ترن بوو. لەگەڵم نەدەگونجا.. دۆراب بوو.. دۆرابم بۆی دەکرد، زبڵم بۆی دەڕشت، دەچوم لە (لەودەی کا)،کام بۆی دەهینا، مریشك و جووجەڵەم دان دەدا، قەت

سەرپێچیم نەدەکرد، ئەوانە هەمووی بەجێی خۆی قەیدی ناکا،بەلام ئەو بێ مرودتە بەرماوەی کچە تیمەکانی خۆی دەخواردم دەدا، زۆرم بەلاوە ئەستەم بوو بەرماوە بخۆم، جاری وابوو لە ڕکڕا دەچووم نەمدەخوارد،پڕهەڵدەمام.. ئەو بێویژدانە ئەوەشی لێم دەکرد بیانوو،لای باوکم شکاتی لێم دەکرد دیسان بابم نەیدەکردە نامەردی،حەمە..! ساوار ناخۆی.پێمبڵی کێندەرت نایشێ..؟!

.. ئیدی ئەم بەزم و ڕەزمە هەر بەقسە خۆشە، ئەگەرنا زۆری خایاند، چونکە لەگەڵ زڕ دایکم هەرگیز(دانوو) مان پێکەوە نەدەکوولا، هەموو ڕۆژێ شەڕو گاڵە و هەڵلاّمان بوو.. شەڕوهەڵلاکەش بە دەستی باوکم و بە داپەڵۆسینی من کۆتایی دەهات..

.. گەلێ شەوان بەزگی برسی دەچووم لە (کادین)ێ دەخەوتم، بەیانییان جاری وابوو بەخورینی، بەبێ قاوەڵتی هێستره قوولەم کورتان دەکرد، شەغرەم لێباردەکرد. سوار دەبووم دەچووم بۆ سەر پەرێز.. شەغرەکێش بووم شەغرەی قرشەم لێدەنا. هێستره قوولەم وەپێشە خۆم دەدا. یاغر یاغر بەپێی هێستره قوولە بەرەو ئاوایی دەهاتینەوە، بەرێوە..! بیرم لە حاڵی خۆم دەکردەوە، بیرم لەم شەڕو گاڵەیە دەکردەوە، دەبێ کەی بەکۆتابێ..؟!

..نەمدەزانی گوناحی من چییە..؟! سەرم لە دلڕقی باوکم دا سووڕمابوو، شەوێکیان بە ئاشکرا دەیگۆت!

(گەورەو تەواوی، بوویتە زەلام، ئیتر بەسە بڕۆ بەرۆکمان بەردە. بابۆخۆمان کەمێك ئیسراحەت بکەین).

..تێفکریم. سەری هێران و بنی گەواران من بووم..لە دڵی خۆمدا گووتم: باوکم ڕاست دەکات گەورە بوومە.

بوومەتە زەلام، تەمەنم بەرەو چوارده(١٤) هەڵکشاوە، بوومەتە بارگرانی لەسەریان، واچاکە بەرۆکیان بەردەم، بابەرچاویان چۆڵکەم، بابۆخۆیان ئاسوده بن بابە ئاسوودەیی بژین، منیش بەدوای چارەنووسی خۆمدا برۆم چاترە.

## بەشی پێنجەم

..وابوو سبیانەکێ زوو تاریك و ڕوونی بەیانی، ئەوکاتەی کەکیژە عازەبەکان لـە جێی ژووانێ، بەدوا ماچی خۆشەویستی زۆر بە ئەسپایی کوڕە لاوەکان بەڕێ دەکەن.. لە خەو هەستام و خۆم تەیاردا چووم هێستره قوولەم کورتان کرد لیی سوار بووم، ڕێی شارم گرتە بەرو باژۆ.. کاتێ گەییمە دووڕیانەکە هەوسارم لێ گورج کردەوە، هێستره قووله سەنگرایەوە، پاشان ڕاوەستا، ئاوڕێکی دواوەی داوە.. منیش هەر لـە سـەر پشتی هێستره قووله ئاوڕێکی دواوەم داوە ..! خۆر تازە گـەزنگی دابـوو. ئـەو کاتـە بوو کەتازە بووك و شۆخە ژنان بە ئەسپایی باسکیان لـە ژێـر سـەری هاوسـەرەکانیان دەدزنەوە نەبادا لە خەو بن، وەلە ترسی پرتەو بۆڵەی خەسوو، لە شەرمی خـەزووریان بە هێواشی بەسەر قانەدرمەدا دادەبەزنە خوارەوە ڕوەو سەرشۆك تێدەقێنن..

(لێرە لە ناخەوە ئاهێکی ساردوو قووڵی هەڵکێشا، چاوم لێبوو چاوی پڕ بـوو لـە فرمێسکی حەسرەت، هەوڵیدا فرمێسکی قەتیس ماوی چاوەکانی لە من بشارێتەوە، بەلاّم بێ هوودە بوو، دڵۆپ، دڵۆپ بە سەر ڕوومەتی..چورچ و لۆچی دا،بەنێو ڕیـشی ماش و برنجی دا غلۆردەبونەوە،تاوێ بێدەنگ بوو، دواتر جگەرەیەکی داگیرساند زۆر بە توندی قومی لێدەدا، هـەناوی پـڕ دووکـەڵ دەبوو،جگەرەکـەی تـەواو نـەکردبوو). هاتەوە گۆ پێداچوو گوتی:

..لە هەمووی جوانترو قەشەنگ تر لەم سـبەینەیەدا..!

دیەنی دوکەڵی سۆبەی بە قشپڵی پیرەژنەکان بوو، لە ناوەڕاستی حەوشەی ماڵـە کانیان دا هەلاّوەی ئاگرو چڕە دوکەڵ بـە ئاسمانـدا هـەڵ دەچـوو، قـەت ئـەو گونـدەی خۆمانم ئەوها بەم جوانیە نەدیتبوو، هەردوو دیدەم تژی ڕۆندك ببوون، هەر مابوو لـە هاڕژنی گریان بدەم.. لەسەر پشتی هێستره قووله دابەزیم قەڕاسەکەیم لە ملی ئالاّند پاشان هەردوو دەستم هاویشتە ملی ئاوێزانی بووم پێمگوت ! ئازیزم قوولەگیان، من

دەڕۆم سەر هەڵدەگرم، باوەڕناکەم جارێکی تر بە دیداری یەکتر شاد بینەوە، چونکی نازانم چارەنووس بەچی دەگات .. گیانەکەم قولـە گیان، دەزانم زۆرم ئەزیەت دای، بەلاّم من و تۆ هاودەردو هاوخەمین، خۆ تۆ لە هەموو کەس چاکتر دەزانی کەمن ..! ئاگام لە خۆم نەبووە، بۆیە داوای لێ بوردن دەکەم قوولـە گیان، ئێمە دوو هاوڕێی گیانی بەگیانی و کۆستکەوتەبووین،من کۆستکەوتەی بێ میهری و سۆزی دایك بووم،تۆش.. زوڵم وستەمی (خەسان) دن. کۆستکەوتەی (پەڕین) بووی..بۆیە دڵنیام لەوەی کە لێم دەبوری منیش، پڕ بە دڵ لە دەرونەوە لە یەزدانی مەزن دەپاڕێمەوە! هەموو ساڵێك بەهاری خۆش بێ، دەغڵ و دان زۆر بێ، وابێ هیچ کاتێك لە زستان و لە پاییز، لە چوار وەرزی ساڵ بە برسییێتی نەمینێیتەوە.. پاشان نێو چەوانیم ماچ کرد،دیتم .. فرمێسك لە چاوەکانیدا قەتیس مابوون، پێمگوت : دەبڕۆ قوولـە گیان برۆ، یەکسەر بڕۆوە بۆ ماڵ هەتاکو زووە، بابە دواتدا نەگەڕێن، شەپە دەستەکم خێواندە سەر پاشەڵی،دوو،سێ هەنگاو بە دوور کەوتەوە دواتر ڕاوەستا، ئاورێکی قنجی لێدامەوە، نازانم گەرەکی بوو خودا حافیزیم لێبکات، یان دەیویست پێمبڵێ..! وەرە لە کەلی شەیتان وەرە خوارێ ناوی خودای لێ بێنە با پێکەوە بگەڕێنەوە ماڵێ .. تاوێکی خۆش بێ چاو تروکاندن سەیری یەکدیمان کرد، پاشان بەدەنگێکی بەرزو گڕ هاوارم لێکرد..! ئەوە بۆچی ڕاوەستاوی نارۆی..؟! ئەی پێمنەگوتی : هەتا زووە بڕۆوە بۆ ماڵ.. لە جێی خۆی چەقی بوو نەدەجولا، بەلاّم چەند جار لەسەر یەکدی فرماندی.. وەکو ئەوەی

یاخی بێ پێگیری بکات، بڵێ: نەخێر بە تەنیا نارۆم. زۆری لێ توورە بووم . دوو . سێ کەستەکم هەڵگرتەوە ڕاموەشاندێ، تێم سرەواند. پێمگووت: بڕۆ ڕانەوەستی ها، ببینم ڕاوەستی وات لە حالی .. کە زانی لێم توند کرد . ناچار بوو ڕووەو ئاوایی ملی نا ڕۆیی.. هەتا لە پێش چاوم بزر بوو فرمێسکم بۆی هەڵڕشت، پاشان هەناسەیەکی ساردم لەناخەوە هەڵکێشاوگوتم: خودایە بە نومێدی تۆ، هەر تۆ کەسی بێ کەسانی، ڕێ نیشاندەری سەر لێ شێواو، لێقەوماوانی، بۆ دواجار ئاورێکم لە ئاوایی داوە، شوان مێگەلّیان ڕادا بوو، تۆز بەری لە ئاسمان گرتبوو.. پاشان هەیام لێکرد ڕێگای شارم گرتەبەر.

# بەشی شەشەم

..کاتێ گەیمە شار نیوڕان لە کەلی کەوتبوو.. هەڵوێستەکم کرد هەر لە بەر خۆمەوە گوتم: باشە ڕووبکەمە کێندەر..؟! نازانم، پاشان هێدی هێدی لەم شەقام بۆ ئەم شەقام، وەکو گێژ دەگەڕام و دەسووڕام..(مرۆی نابەڵەد کتومت وەکو ئەو باڵندەیە کە هێلانەی لێ تێکدەچێ بەبێ هێلانی دەمێنێتەوە سەری لێدەشێوێ، لە هیچ جێیەك تۆتکە ناگرێ هەر دەگەڕێ).

..هێندە گەڕام و سووڕام هیلابووم . بەپێش دەرگای مزگەوتێکدا ڕەتبووم،دوو،سێ هەنگاو تێپەڕیم و گەڕامەوە، لامدایە مزگەوت دەستوپلو دەموچاوو پێم شوشت کەمێك هاتمەوە سەرەخۆ.. دیقەتم دا هەیوانی مزگەوت فێنك و خۆش بوو، خەڵك لێی ڕاکشابوون.. وەکو ئەو خەڵکە ئاسای چووم لە هەیوانی مزگەوت پشدێنەکەم لە پشت خۆم کردەوە،لوولم دا کردمە سەرین لە سەر تەنیشت لێ ڕاکشام، ئیدی نغرۆی خەیاڵ بووم..(باشە ئەوە هاتم بۆ شار ئەی گوزەران ..؟! چۆن بیگوزەرێنم..؟! باشە ئەی شەوان لە کوێ بحەوێمەوە).. ئەم پرسیارانەو دەیان پرسیاری دیکە.. لەناو کیشوەری

کەللەسەرم دا ویزە ویزیان بوو، وەکوهەزار پێ ئاسای چنگوڕکیان لە مۆخم گیردەکرد کاسیان کردبووم داوای وەڵامیان دەکرد.. لەناکاو تەقا هورگم قۆڕاندی..! برسیمە، لەجێوە ڕاست بوومەوە سەر قوون هەردوو دەستم لە ئەژنۆم وەرێنا، کزو مات و مەلوول بیرم لە حاڵی خۆم دەکردەوە، تفم لە چارەنووسی خۆم دەکرد وبەزەییم بە خۆمدا

دەهاتەوە، لەدڵی خۆمدا دەمگوت:

( خودایە دەبێ گوناحی من چی بێ ..؟! بەم دەردە سەرییەوە بژیم، ئاخر کەی

بەم سەگ مەرگییە دەڵێن ژیان ها)؟!

..ئـەم پرسـیارانە وەڕسـیان کـردم.. ناچـار هەسـتامەوە هنـدامی خـۆم ڕێکخستەوە، پشتێنەکەم لە پشتم ئالاندەوە کەوشەکانم لە پێکرد.. پـێش ئـەوەی لـە مزگـەوت دەرچـمە دەرەوە، دیـتم..! نیـو دیناریـەکی قـاوەیی لـەبن دیـواری کەوتبوو، بۆی چووم هەڵی بگرمەوە، بـەلام هەرچی ئەنـدامی لەشـم بـوو گـشتی دەلـەرزی، ترسـام، بەدیاریـەوە ڕاوەسـتام، کەوتمـە دڵـەڕاوکێ.. هەڵیبگرمـەوە، هەڵینەگرمەوە نازانم بۆچی دەترسام..؟!

.. دواجاربە ئەسپایی پێم خستە سـەرنیو دینارەکـە وەبنـی پێـی خـۆم خـست بزرمکرد..تاوێ چەقیم لە جێوە نەبزووتم

هەستم لە خۆم بڕی .. بـەلام لـە نـاوەوە هەناوەکوتـەم بـوو، سـەیری ئـەملاو ئەولامکردکەس چاوی لە من نەبوو، بۆی داچەمامەوە..(هەڵۆ)ئاسای چۆن چنگی لە نێچیر گیر دەکات، ئەوها چنگم لە نیو دینارەکەداو توند لە ناو مستم دا گـرتم ئەفەس بڕم کردبوو، لە مستم دا نارەقەی شـین و مـۆری دەردابـوو، ئـەوها قیڕبـڕم کردبوو خەریکبوو بخنکێ.. پاشان بە سپایی خستمە بنی باخەڵم، باشبوو لە مردن ڕزگاری بوو، ڕۆیشتم،لەڕۆیشتنا هورگم لە هەڵلاێدا..١برسیمە.

..بەکۆلانێکی ناو بازاڕدا تێپەڕیم دیتم لەمبەرو ئەوەبەری کۆلان (نان) لەسەر سـەبەتان دانرابـوو، پیرەمێردێکـی ڕیـش چـەرموو لـەڕیزی نانفرۆشـەکان،دوو، تەبەق(حەڵوا)ی زەردوو سپی دانابوو.. پیاو، ئەخاسمە پیاوی برسی سەر بەخۆ

ئیشتهای دەچووێ،سێ(٣) نان و هەنـدێك حـەڵوام لێکـڕی، لـە پـەنای دیـوار ڕوونشتم، دوونانم بەحەڵواوە خوارد، هێندە

بەتام ولەزەت و خۆش بووهۆشی وەبەر هێنامەوە..نانێـك و هەنـدێك حـەڵوام هێشتەوە لوولم دا دەباخەڵم نـا، سوپاسـی یـەزدانم کـرد..(خودایـە ئـەوەی لـە تـۆ غافری کافرە).

..پاشان هەستامەوە سەر پێ هێدی هێـدی بـەبازاڕی ئاسـنگەراندا ڕەتبـووم، بـەبازاڕی قەسـاباندا ڕابـوردم، وەختێـك گەیـمە بـازاڕ و کـۆلانی کورتـان درووان..کوورتان و سەرکەلەی نایاب و جوان بە پێش دوکانەکاندا هەڵواسرابوون..

لەو کاتەدا بیری هێستره قوولەم کردەوە، لە دڵی خۆمدا دەمگوت:

(ئەم سەرکەڵە جوان و ئەو گورینگە ڕەنگاوڕەنگانە شایستەو لایق بە هێستره قوولەن..ئای قوولە گیان هەرمن دەزانم چەند ماندوو،و شەکەتی).. ئەم گەڕان وسووڕانەدا(خەڕ) ئەو شتانەی کە دەکەوتنە بەر دیدەم سەبارەت بە من سەرنجڕاکێش بوون،هەستم بە ماندوو بوون و هیلاکی ئەو گەڕان و سوڕانە نەدەکرد، وەختێك زانیم هێوارەیە..! هەر دووکاندار بوو، غرم م..دەرەبانەی دووکانەکەی دادەگرت، قوفلێك، یان دووقوفڵی گەورەی لێدەداو دەڕۆیی.. بەلاّم کە چەند هەنگاوێك بەدوور دەکەوتەوە دەسەنگرانەوە. ئاوڕێکی قنجی لە قوفڵەکان دەداوە.. دڵنیادەبوو لەوەی کە

قوفڵی داوە.. دواتر سەری هەڵدەگرت دەڕۆیی.. لە شەقامێکدا کەتەنها یەك چایخانەمابوو هێشتا پای دۆزی لێنەکردبوو، لامدا چووم لە سەر تەختێك دانیشم.. چایچی، چایەکی هێنا، چایەکم فڕکرد..دیار بوو دانیشتوانی چایخانەکە یەك یەکو دوو دوو لە هەڵسان بوون، هەڵدەستان چۆڵیان دەکرد دەڕۆیشتن، نیدی هێواش هێواش پەرتەیان لێکرد..دیقەتم دابووە چایچییەکە دیار بوو بە کاوەخۆ خەریکبوو قاوەجاغەکەی خاوێن دەکردەوە، تەبلەکانی دەسڕیەوە دواتر بە گێسك ئەو ناوەی گەسك دا، لەسەرەخۆ ئیشەکانی تەواو کرد، چاوم لێبوو دەست و دەموچاوی خۆی شوشت، پڕدێن و بەر پڕدێنی خۆی توند کردەوە، پاشان جگەرەیەکی داگیرساند.. من لە جێوە خۆم لە گوڕ نەبرد نەبزووتم، هەرچەندی(ئەو) بە ئەنقەست خۆی مژوول دەکرد پێی وابوو کەمن هەڵدەستم دەڕۆم، نەخێر. لە جێوە جوولەم نەکرد..ناچار لێم هاتە پێش گوتی:

- ڕۆڵە درەنگە، هەستە بڕۆوە بۆ ماڵ نەکودرەنگت بەسەردابێ.!

-وەستا دەڕۆم..بەلاّم نازانم بۆ کوێ بڕۆم..؟!

-هات لە تەنیشتم دانیشت پرسی:

- باشە بۆچی نازانی بۆ کوێ بڕۆی.؟!

- چونکە نابەلەدم..

-ئەی ماڵتان لە کوێیە.؟!

- ماڵمان لە دەشتە، لەگوند دادەنیشین بۆیە نەشارەزام.
- باشە ئەی چی تۆی گەیاندە شار.؟!
- بەنیشی ماڵەوە هاتم بۆشار، شەوم بەسەرداهات.نازانم رووبکەمە کێندەر تاکو رۆژم لێ هەڵدێتەوە.؟!
- کورم . ئەگەر پارەت هەڵگرتووە..؟!

ئەوە چاکو چێتر، بڕۆ بۆ هوتێل پارەی خۆت بدەوبێ منەتە،ئەگەرنا، ئەوە مزگەوت زۆری وەکو تۆ شەوان لە وێندەر دەخەون، شەوەك، هەر شەوەکە هەرچۆنێك بێ شەوێکە دەقەتێ.

..ئیدی هەستامەوە پارەی چایەکەم وێدا، خودا حافیزیم لێکرد رۆیشتم، مزگەوت خۆت بگرە واهاتم، چووم لە هەیوانی مزگەوت لەسەر تەشکە بەرێك، حەسیرەکی شڕی لەبن دا بوو روونشتم..نان و حەڵواکەم هەروێمابوو، کردمە بابۆ لەو خواردم، لەنیو دینارەکە نازانم چەندم لێ بەنان و حەڵوادابوو چەندم پێمابوو.. لە لچکی کراسەکەم گرێ دا، کراشەکانم کردە سەرین و پاڵم داوە جەمەدانیم بە سەرە خۆمدا هەڵکێشا.. هاوین بوو، شەوانی هاوین خۆشە لێ خەوتم..شەوێ..! سێ چوار جار بە ئاگا دەهاتم، چونکە هۆش و بیرم لای پارەکەم بوو، دەستم دەگەیاندە پارەکەدڵنیا دەبووم، دەخەوتمەوە .. ئیدی دەگەڵ سەدای (کەبار) و بانگی نوێژی بەیانی و غەڵبە غەڵبی نوێژکەران بە ئاگاهاتم، کەڵکی خەوتنی نەما، ناچار هەستام بەرو پژدێنی خۆم تونندکردەوەو کراشەکانم لەپێ کرد رۆیشتم ..لەم شەقام بۆ ئەو شەقام، وەکو سەر لێ شێواو نەمدەزانی بە دوایی چیدا دەگەڕێم ..؟!

# بەشی حەوتەم

..کاتێك چێشتەنگاو قایم بوو هێشتانەکی تفەرکی زادم نەکردبوو برسیم بوو، وەختێك دیتم..!! بە پانتایی شەقام مرۆ گەل بوو دەهاتن، لە بەرایی حەشیمەتی ئاپۆرای خەڵکەکەدا، یەکێك ئالآیەکی کەسکی هەڵگرتبوو، دوا بەدوای ئەو، چوار،پێنج دەفژەن و تەپل لێدەر گەرمیان کردبوو مەپرسە.. دوابەدوای ئەوانیش چەند کەسانێك پرچیان بەردابۆوە شیرو قلنج و زەرگیان لە دەست دا بوو لەگەل ئاوازی تەپل ودەفژەنەکان دەروێشانە هەڵدەبەزین و داددبەزین سەرگەرمی سەماو هەڵپەڕین بوون گەرمیان کردبوو.

.. دوا بەدوای ئەمانیشەوە (دارەبازە)یەك لەسەرشانی چەند کەسانێکەوە بوو ناوەناوە یەکێك بەدەنگی بڵند دەیگوت:

(لااله الاالله). خۆی لەبەر دارەبازەکە ڕادەکرد، بەچوار دەستەوبە دەستەوا کۆچکردوویان هەڵدەگرت،

..دوا بەدوای ئەمانیشەوە حەشیمەتی خەڵکێکی زۆر بەبێ دەنگی بە دوای دارەبازەکەبوون بەرەو گۆڕستان بەڕێوەبوون، منیش..هەردوو دەستم لەپشتڕا تێکئالآند لەگەڵیان کەوتمەڕێ..

..ئیدی بە دەست گەرمی کۆچکردوویان بەخاکسپارد، دوای تەلقین و سورەتی (فاتیحە)،بەخێری خودا لێخۆشبوو

نان و حەلواو خورمایان بەخشییەوە،ئەزیش نان و حەلوای خۆم وەرگرت کردمە قاوەڵتی.. پاشان کە تێربووم لە دڵی خۆمدا گووتم (هەزار ڕەحمەت لە گیانی ڕەحمەتی کۆچکردوو.خودا لەگوناحەکانی خۆش بێت).

..باشبوو بەهۆی ڕەحمەتی ژەمی ئەم بەیانییەم لەکۆڵ بۆوە، دەمەدەمی نیوەڕۆبوو، لە دڵی خۆمەوە گووتم: بۆ ژەمی ئێوارەش خودا کەریمە)..ئیدی یاغر

یاغر بە بازاڕی سەوزە فرۆشاندا دەڕۆیشتم، کابرایەکی ئەفەندی زەمبیلەك سەوزەو میوەی کڕی بوو بەدیارییەوە ڕاوەستابوو چاوی دەگێڕا.. گوێم لێبوو بانگی کرد گووتی: وەرە..ودرە کوڕی باش. لههەوڵجار نەمزانی بانگی من دەکات، نەمجارەیان بە دەست ئاماژەی بۆ مکرد، دەستی لێم هەڵشەقاند گوتی:

-لەگەڵ تومە وەرە:

-دڵنیا نەبووم لەگەڵ منیەتی، گوتم:

- لەگەڵ منتە.؟!

- ئاا .. وەرە حەمالی ناکەی..؟!

وەرە هەتاکو ماڵ ئەم زەمبیلەم بۆ هەڵگرە.

.. بێ چەندو چوون زەمبیلەکەم هەڵگرت، ئەفەندی لە پێشەوە منیش لەدواوەی بەڕێکەوتین، لەم گەڕەك بۆ ئەو گەڕەك، لەو کۆڵان بۆ ئەو کۆڵان، دواجار ئەفەندی لە پێش دەرگای حەوشەی خانووەکی دوونهۆمی ڕاوەستا..

زەمبیلەکەی لێم وەرگرت داینا سەرعاردی، ئەز، خەریکبووم بگەڕێمەوە. ئەفەندی گووتی: (ڕاوەستە کوڕم باهەقی ماندووبونت بدەمێ).

..دەستی نایە گیرفانی هەندێك پارەی هوردەی دەرێنا، هەندێکی لێ هەڵبژارد گوتی: هابگرە کوڕم.

.. لە یادم نەماوە نازانم چەند(عانە) بوو، بە شەرمەوە پارەکەم لێوەرگرت.. پاشان بەکوێدا هاتبوین هە ر بەوێدا گەڕامەوە بۆ بازاڕی سەوزە فرۆشان... دیقەتم دا ئەوانەی خەریکی ئەم جۆرە کارەن..(کاری حەمباڵی) زۆرن. هەموویان هاوتەمەنی خۆم بوون، هەموو سەرمایەو دەستمایەیان بریتی بوو لە زەمبیلەك و گوشێکی بەتاڵ و هیچی تر..سروشتی کارەکە ئەوهابوو..! هەرکەسێك زەمبیلەك و میوەو کەل و پەل و شتی پێویستی کڕیبایە، جاری وابوو خاوەنی خۆی بانگی دەکرد..! حەمبال..حەمبال.

..یان هاوتەمەنەکانم ڕایاندەکرد پێشیان لە کابرا دەگرتەوە دەیانگووت: مامە حەمبارت ناوێ.؟!

..بادرێژەی نەدەمێ، تاقم و تەدارەك، واتا(گوشێك و زەمبیلە) کم کڕی..

بەیانیان زوو زەمبیلەم بەشانم وەدەکرد، هەیپام لێ دەکرد دەچوومە بازاڕی سەوزە فرۆشاندا، هەتاکو دەمەدەمی نیوەڕۆ، بەڵام بۆ دانی عەسران

دەچوومە گوزەری پەنیر فرۆشان تاکو هێوارێ خەریکی حەمباڵی دەبوم.. هێدی هێدی لەگەڵ سروشتی کارەکە لێڕاهاتم، دەستکەوتم باشبوو، من، وەکو هاوکارەکانم چەقاوەسوو، چەنەباز نەبووم، بەدەگمەن ئەگینا تێکەڵیان نەدەبووم، وەکو ئەوان شەڕە تەماتەو پەلکە شووتیم نەدەکرد، لەگەڵ دوکاندارەکان ناشنایەتیم پەیدا کردبوو، شارەزام ببوون خۆشیان دەویستم، هەرئیشەکی هەیانبوایە بانگیان دەکردم.. بۆیە هاوکارانم خۆشیان بەمن نەدەهات،بەغەزەب تەماشایان دەکردم لە دەروونەوە دەیانبوغزاندم، بە ئاشکرا گێچەڵیان پێمدەکرد، گەرەکیان بوو بە چاوو ڕاو چاوترسێنم بکەن . وابی لەم گوزەرە بەدەرمنێن، هە رچەندی خۆم لە گێلی دەدا، ئەخێر بێهوودەبوو، ئەوان وەکو کەڵەباب موکرتردەبوون، تێفکریم لە دڵی خۆمدا گوت:(حیزی هەنبانە لۆکەیە،

هەتا تێی پەستی دەیگرێ)نا، وا چاکە هەتاکوو دەستیان پێم فێرنەبووە، با من لە پێشدا دەستی خۆم بوەشێنم ، هەرچی دەبی بابیی)

..ڕۆژێکیان دەمەدەمی چێشتەنگاوبوو، چوار، پێنج، لە حەمباڵەکان لەناوەڕاستی بازاڕی سەوزە فرۆشان دا پێکەوە ڕاوەستابوون فسکە فسکیان بوو.. من خۆم لە گورەنەبرد، بەبەر دەمیاندا ڕەتبووم.. یەکێکیان جرتێکی بۆم کێشا

ئەمما جرت، نەمزانی کامەیان بوو، گەڕامەوە هیچ سێ و دووم لێنەکرد، دوو شەقازللەم خێواندە بنا گوێی یەکێکیان تووند بەرۆکم گرت، دەستی هەڵنەهێنا گووتی: خۆ من نەبوم لۆ لێم دەدەی یەکێکی دیکەیان کەوتبوە لاشانی ڕاستەم، یەك پشتە دەستم خێواندە دەموچاوی، بە هەردوو دەست دەمو چاوی خۆی گرت، لە هارژنی گریانی دا، یەکێکی دیکەیان بە تەمابوو خۆی تاقی بکاتەوە، نەمهێشت بەخۆ بکەوێ شەقێك و شاپێکم خێواندە قوونی، دەستی بەخۆیدا شۆڕ کردەوە، خۆم لە دوانەکەی دیکە مۆڕکردەوە، چاوی خۆیان بەرداوە متەقیان نەکرد .. ئیدی لەو ڕۆژەوە چاویان شکا، ببڕای ببڕ جورئەتیان نەکرد جارێکی تر گێچەڵم پێبکەن.

# بەشی هەشتەم

..شەوان دەچومە مزگەوت، هەژارو بێدەرەتانی وەکو خۆم ئاسای زۆربوون لـە مزگـەوت، شـەوان لنگمـان لێڕادەکێـشا دەخـەوتین، لەگـەڵ کـازیوە پەرتـەمان لێدەکرد..بەلاّم کاتێ کەوتینە نـاو وەرزی پـاییز، شـەوانی پایزسـاردە، بەتایبـەتی بەرە بەری بەیانییان ساردی دەکات، لەسەر حەسـیر نەدەحەوامـەوە لـە سـەرمان، ناچار بووم بڕۆم بـۆ هوتێـل ژوورێکـم بـە کـرێ گـرت.. دوو سـاڵ بـوو بـەزەمبیل خەریکی کۆڵهەڵگری بووم شەوانیش لە هوتێل دەخەوتم،بەلاّم چ هوتێـل..! سـەت خۆزگە بە هۆرەمەڕ، بۆنێکی ساردو ناخۆش و گرمخای لێ دەهات ..

جگە لەوەش بەهۆی هاتەچۆو دەنگە دەنگی میوانان ئیسراحەتم نـەبوو، بۆیـە بیرم لە جێگایەك، لەشوێنێکی چاکترو نارامتر کردەوە.. بەهـەر حـاڵی هـەبوو لـە حەساری ((حەمەئاغا)) کـەوتبوە گـەڕەکی کورەچـیان لەسـەر ڕێگـای(مەحەتـە) ژوورێکم بەکرێ گرت، ژوورەکانی گـەورەوە فـراوان بـوون، ئـەو حەسـارە لـە سـەر ئەندازەی کۆن، وەکو حەسـاری لادێ خانوو لە تەك خانوو دروست کرابـوو، پـتر لـە (٢٠) بیست ژووری تێدابوو، تـەنها یـەك دەرگـای گـەورەی هـەبوو(قەنتـەرە)یـان پێدەگووت.. ژوورەکـان بـەر بـەرەڵلاّبوون پێـشیان چـۆڵ بـوو، کرێـچیەکان خۆیـان شورەیان بۆ چێکردبوو، لەناو شورەکەدا دووقوژبنیـان لێدروسـت کردبـوو، یـەکیان (ناندین) ئەوەکەی دیکەیان (سەرشۆرك) بوو.. دانیشتوانی حەسار هەر هەموویان هەژارو لێقەوماو، بێدەرەتان و کەم دەرامەت بوون.تابڵێی:

سادەو سـاکارە سـاویلکەو ڕووخۆش و خزم دۆست بوون، هەروەك ئـەوەی بڵێـی: هەر هەموویان یەك بنەماڵەن، قەت لێیـان بێـزار نـەدەبوی، بـە هانـای یـەکترەوە دەهاتن، یارمەتی یەکتریان دەدا، ئەگەر یـەکێکیان نـەخۆش کەوتبایـە بێگومـان

هەر هەموویان لە هێوارێوە بەدیار سەریەوە دادەنیشتن، ئەوە هەر منەتی تێدا نەبوو، ئەو بیست خێزانەلەو حەسارەدا دەژیان، هەرگیز گوێت لە قرِوگاڵە نەدەبوو، بڵێی: لەسەر منداڵ لێك لالوت بن، دەنگیان لێوەبێ، نەخێر شتی وا لەئارادا نەبوو.. سبەینان زوو هەڵدەستام و دەچوومە بازارِ خەریکی کاسبی بووم، هێواریێ کەدەهاتمەوە (چرا) کەم دادەگیرساند، مەقەرەی رِژووم ئاگردەدا، کەخەڵوزەکەتەوا گەش دەبۆوە، کتری چام دەخستە بانی.. جوان دێمی دەدا، دوو، سێ پیاڵە چایەم دەخواردەوە، هەندێ جار بەدەم چاخواردنەوە سواری ئەسپی خەیاڵ دەبووم دەگەرِامەوە بۆ گوندەکەی خۆمان.. نغرۆی شەرِو گاڵەی زرِدایکم و لێدان و کوتانی باوکم و پێکەنینی گاڵتەجاری دێڵە سەگەکانی زرِداکم و هێستره قوولەو.. کاتێك خەوم لێدەکەوت.. زۆربەی هەرە زۆری شەوان دایکم دەهاتەوە خەونم لە خەونم دا دەیلاواندمەوە..!

..رِۆژانی هاوین زۆر گەرمە لەبن نایەت، کاتی نیوەرِۆیان هاتوو چۆکەم دەبوو، بازارِتاکو تەرا، ئەگینا چۆل دەبوو، کرِین فرۆتن کزو سست دەبوو، بۆیە دوکاندارەکان وەرِس دەبوون ..هەربابا بوو دەرەبانەی دوکانکەی غرم دادەگرت دەرِۆیشتنەوە بۆ ماڵ، تاکو دەمەدەمی نوێژی ناوەند (عەسر) بازارِ بەجولە دەکەوتەوە .. جا کاتێ

دوکاندار دەچونەوە بۆ ماڵ..منیش بۆ پشوودان دەچوومەوە بۆ ماڵ..بۆرِی ئاوی پاك کەوتبوە قەنتەرە،نیوەرِۆیان کەدەچوومەوە لامەدەدا دەست و دەم و چاو.و پێم دەشوشت.. نیوەرِۆیەکیان ویستم لادەم دەست و دەم و چاو

بشۆم.دیتم..! کچێك لەپێش بۆرِی ئاو دانیشتیە تەنەکەی ئاوی دایتە بەر بەلوعە .. کەپێ حەسیا دەمەوێ دەستم بشۆم.. تەنەکەکەی وەلاوەناو دوو، سێ هەنگاو لە بۆرِی ئاوەکە بەدوور کەوتەوە.. دەستو چاوم شوشت بە هێواشی کشامەوە سەرم هەڵبرِی زۆر بە نەزاکەتەوە سوپاسم کرد، بەلاّم لێوی لێك نەترازاند من بەزەمبیلان زۆرم شتومەك بۆ ماڵان بردووتەوە، نیگام لە نیگای کچە عازەب و شۆخ و شەنگ و قەیرەژنی تەرِپیر چەقیوە.. هەرگیز بە خەیاڵم دا نەهاتوون،توشی هی ئەوها بووبە هەر مەپرسە..؟! قەت خۆم لە گورە نەبردووە،

نەسلەڵ هەر بەخەیاڵمدا نەهاتوون، بەلاّم نازانم ئەوەچی بوو..؟! کە چاوم بەچاوی ئەم کچە کەوت بۆچی شڵەژام..؟!

ئیدی هەتا گەیە بەر قاپی ژوورەکەی خۆم. ناوەناوە ئاوڕم لێدەداوە، چوومە ژوورێ ئۆقرەم نەگرت، دەربەڕیمەوە دەرەوە، لەنێو شوورەکە ڕاوەستام، چاوەچاو بووم تادەگەڕێتەوە، تاکو پێبکەوم بزانم ئەم (پەری) یە کچی کامەماڵە.. لە بەختی من تەنەکە ئاوی خستبوە سەرشانی بەپێش قاپی ژوورەکەم داهات تێپەڕی..سێرەم لێگرتبوو، هەر لەڕیزی ژوورەکەی من چوار ژوور لە هەورازتر ماڵی ئەوان بوو.. چاوم لێبوو کە گەیشتەوە ماڵ تەنەکەی ئاوی دانا، پاشان هاتەوە دەرێ، دیار بوو ئەویش هەستی بەشتێك کردبوو ئاوڕێکی گورگانەی لێدامەوە، پێکاندمی بەندی جگەرم پسا، دیاربوو کەزییەکانی تەڕببوون، بایدەداو ئاوی لێدەچوڕاندەوە، نەخێر کەزی تەڕبوون و ئاو چۆڕاننەوەی چی..؟! ئاگری لە دڵم داگیرساند، هەناوم بۆن سۆو بۆن کڕووزی لێدەهات.

## بەشی نۆیەم

..ئیدی ڕۆژهاتوو شەو بوری، پاشان پێکەوتم زەینەب ..؟! هێندە جوان و شۆخ و وشەنگ و نازدار و ڕەندبوو شەڕ لەگەڵ پەری بەهەشت دەکات، لای هەمووان خۆشەویست بوو لە خۆشەویستیان بە (زینۆخان) بانگیان دەکرد، زینۆ جوانێك بوو هاوتای نەبوو، بەژن وبالآبەرز، وەك شەنگەبی وابوو، هێندە شلك و تەنك و ناسك بوو، بە(با)ی بسکان دەلەرزی. جوانێك بوو ناوقەد باریك دەتگووت داری حەیزەرانە هەڵچووە.ئەسمەرێکی خوێن شیرین، پرچی ڕەشی قەترانی،هەردوو شابسکی بەسەرسینگ و مەمکی دا پەخشکردبوو مەپرسە، لە پشتەوە پرچی کردبووە دووکەزی هوناندبوویەوە،چەفیەکی سوری گوڵ گوڵی بەلاری لەسەری خۆی دەبەستا، ئەوە هێندەیترجوانی کردبوو، چاو .چ چاو.؟! دەڵێن: (چاو هەیە بۆزیارەتکردن باشە، چاویش هەیە بۆ کوێر بوون باشە) .. چاوو، دیدەو ئەبرۆی زینۆخان چاوی زیارەت و شفای دەردەداران بوو، دووچاوی گەش دەتگووت: گەلاوێژن لەتاریکی شەودا ئەدرەوشێتەوە..هەرچەندی دەکەم نازانم چۆن پەسنی ئەو خاڵ ڕەشەی ناوەڕاستی گەردەن بلووری زینۆخان بکەم.. سوبحانەللاَه..لێی ببوو بەنەخش، هەربۆ ئەوە چاکو پیرۆزبوو..؟!

حاجیانی ماڵی خودا لەجەژنی قوربان دەستەدەستە بچن زیارەتی بکەن..باسی گفتو لفتی زینۆناکەم،چەندە شیرن بوو وەلێ کە پێدەکەنی لەب و لێوی دەتگووت: خونچەیە تازە دەپشکوێ، ددانەکانی وەکو مرواری وابوون ..زینۆخان دەیزانی چ تیرێکی ژاراوی هاوێشتووە، دەشیزانی کەنێچیرەکەی پێکاوە و خوێن لەزامو برینی سەردەکات.. بەلاَم لەگەڵ ئەوەشدا..بێ باك. باکی نەبوو، لە دڵی خۆمدا دەمگوت: (لەوانەیە چەندین نێچیری دیکەی پێکاوە و ئاوڕی لێ نەداوەتەوە).. ئیدی ئەو.. ببووە سوارە من پیادە، هەرچەندی دەمکردو دەکۆشام زینۆ

دەستەمۆم نەدەبوو، کەلێی نزیك دەبوومەوە، وەکو کارمامزی سرك و، ووشت دەسلەمیەوە لە خۆی هەڵدەداو دەڕۆی.. بەلاّم لەگەرمەی ڕاکردندا ناوە ناو دەسەنگراوە هەڵوێستەکی دەکرد ئاوڕی دوای دەداوە، دەمزانی ئەم ئاوڕدانەوەی بەدەست خۆی نیە، فێنکایی..دەبەخشیە دڵم.. جارێکیان نوێژی شێوان بوو دیتم زینۆخان تەنەکەیەکی بەدەستیەوە گرتبوو بۆ ئاو هێنان دەچوو،بەبیانوی ئاوەوە مەسینەم بەدەستەوە گرت خۆم گەیاندێ پێمگوت: چۆنی زینۆحان..؟! هیچ خۆی لە گورەنەبرد نەمجارەیان پێمگوت بریا هێندە دڵڕەق نەبای..؟! دیسان

دەنگ نەبوو.. کەتەنەکەی پڕکرد، پاشان بڵندی کرد نایە سەرشانی، دەستم بۆی برد و ویستم مەچەکی بگرم، دەستی لە دەستم هەڵدا گوتی:

- بێ ئەدەب شەرم ناکەی لەخۆتەوە هوڕێنان دەکەی، شێتی. خۆشێت نی.؟! لێیدا ڕۆیی هەناسەساردی کردم، لە جێوە بە حەپەساوی چەقیبووم، لە دواوە بێچاوترووکان سێرەم لێکرتبوو، بەلاّم چاوم لێبوودیسان دوو، سێ جار ئاوڕی لێدامەوە .. زۆر جاری وادەبوو ڕووبەڕوو دەبووین، کەچی هەرچەندی پلارم لێدەدا بێهوودەبوو، دەستەمۆ نەدەبوو.. بۆیە لە حەیبەتان بە خەم دا کەوتبووم، خوێنی خۆم دەخواردەوە. هەر لەبیری ئەوەدا بووم کوو..!

دەستەمۆی بکەم.. دڵم بەوە خۆش بوو هێواران کەدەچوومەوە دەمدیت والەناو شوورەی حەوشەی خۆیان ڕاوەستاوە سەرەتاتکێ و چاوەچاویەتی .. جاری بوو بە ئەنقەست هێواران درەنگ دەچوومەوە، دەمدیت هێشتا لە ناو شوورەدا ڕاوەستاوە.. لەدوورەوە سلاّوێکی عاشقانەم لێدەکرد، نەخێر هەرگیز وەلاّمی نەدەدامەوە،

..زینۆ زۆری جەزرەبەدام، هەرچەندی تێدەفکریم تێی نەدەگەیشتم، بۆچی وادەکات..؟! لە حەژمەتان لە ژیانی خۆم وەڕسبوم، لە دڵی خۆمدا دەمگووت: لەوانەیە دڵی بەلای یەکێکی دیکەوە بێت، من نازانم. بیرو هۆشم

ناڵۆزببوو بژارم بۆنەدەکرا، لێم یاخی ببوو..

نبا لە دوو تۆی ئەم یاخیبوونەدا زینۆخان جێ بهێڵین بزانین چارە نووس بەچی دەگات..؟!

# بەشی دەیەم

..پورە ئامینە بێوەژن بوو، سێ، چوار منداڵی سەرکەو بنکەو کچێکی عـازەبی هەبوو ناوی (ئاسیا) بوو، پوورە ئامین ئانکەروجل شۆری ماڵە بەگلەرودەوڵەمەندەکانی شار بوو، بەبێوەژن کۆشی منداڵەکانی دەژیاند.. ئاسیا کچێکی دڵ تەڕو زمان شـیرن و لێو بەخەندەو دەم بە پێکەنین بوو، دەستە خوشـکی زینۆخـان بـوودەیزانی دونیـا چ باسە.. ئاسیا ڕەوشتێکی سەیری هەبوو بەدەم هەسووکەسێك پێدەکەنی، چاونەترس و بێ شەرم بوو.. چونکە کەسێك نەبوو دەست لەدەستی هەڵدات، پـوورە ئامینـە بـوو ئەویش لە پێناوی نان و بژێوی منداڵەکانی کلۆڵە لەگـەڵ گـەزنگی خۆرەتـاو تـاوەکو زەردە پـەڕی خـۆر ئـاوا بـوون لـە خزمـەتی مـاڵ ئاغـاو بەگلـەرو دەوڵەمـەندەکانی شاردابوو.. زۆر جار گوێم لێدەبوو دەیگوت لەبەر تەشـتی هـەویرو جـل شـۆرین گـۆد بوویمە)

..زۆر جاران کەڵەگەڵ ئاسـیا ڕووبـەڕوو دەبـووین، بەڕوومـدا پێدەکـەنی.. بـەلام هەرچی من بـووم لەبـەرخاتری چـاوی مـەنگوخوماری زینۆخـان، نەمدەویـست ڕووی خۆمی بدەمێ، خۆم لەگێلی دەدا..ئاسیا زۆر جوان و خان و مان بوو، بەلام گـیرۆدەو گرفتاری داوی زینۆخان بـووم.. کەچـی زینـۆ لـێم بیـووە سـوارو منـیش پیـادەبووم. چیبکەم..؟! کە بۆم دەستە نامۆ نابێ خۆ نای کوژم،. لە قاران ولە ڕقی زینۆ هێواش هێواش خۆم لە (ئاسیا) نزیك کردەوە، ئاسیا زۆر خۆش بوو، هەرکاتێك دەرفەتی بـۆ بڕەخـسابایە دەهـات، بـەبێ تـرس و دڵـە ڕاوکـێ دەهاتـەلام، بەتایبـەتی دوای ماڵنووسـتنان دەهـات، بـەزم و ڕەزمـی خـۆش بـوو، دڵـی هـەردەم بـەهار بـوو.. کەپێدەکەنی لەناخـەوە پێدەکـەنی، حـەزی لەگاڵتـەو گـەپ و فـشقیات بـوو.. بـەلام هەرگیز بیری لە کاری پووك و چـرووك نـەدەکردوە، دڵپـاك و بێگـەرد، ئاسـیا بـۆمن فریشتەی خەم ڕەوێن بوو.. کەچی بەم حاڵەشەوە(من)هەسـت و هـۆش و خـەیاڵم لای زینۆخان بوو، قەت لەبیرم نەدەکرد، هەردەم لە پێش چاوم بـوو.. بـەلام بەئەنقەسـت

ماوەیەکی دوورو درێژ خۆم لەزینۆ بێ هەستکرد، لەدڵی خۆم دا گوتم: بزانم چارەنووس لەچی دەگات..؟!

..هێواران کەدەچوومەوە دەمدیت لەناو شورەکەدا ڕاوەستاوە سەرەتاتکێ و چاوەچاویەتی، وەلێ من هەرگیز خۆم لەگورە نەدەبرد..سڵاویشم لێنەدەکرد، خۆم دوورە پەرێز گرتبوو، تومەز زینۆ هەستی بەکاکەوبرالەی نێوان من و ئاسیا کردبوو،لەحەژمەتان وەکو ماری سرِوکوندە بە ژەهری لێهاتبوو،بۆیەلەگەڵ ئاسیا لالووت بوو، دەستەخوشکایەتی جارانی نەمابوو.. ئاسیا پێدەکەنی دەیگوت(دارێکم کێشاوە بە ڕۆحی ئەم مەکربازە، ئەگەر خوێنم فرِکات، ئەگەر نا بەم خەفەتەوە لێی دەکاتە لارِشە)..بە ڕامووسانی ئاسیا کەمێك خەمو خەفەتم سوکتر دەبوو.بۆیە هەتا ئەو رِۆژەی دەمرم بە خاکم دەسپێرن منەتباری ئاسیام.. هێوارەیەك لەهێواران لەکاتی چوونەوەم بۆماڵەوە، تەقا ڕووبەڕووی زینۆ خان بووم. بۆ ئاو هێنان دەچوو. خەریکبوو پێی خۆی گران کرد دەسەنگرایەوە، بەلاّم من بەسەرە خۆم نەهێنا ڕاست ڕۆیشتم.. دوای دوو،سێ، رِۆژی دیکە هێوارەکیان دنیا ئەنگۆرە بوو، دیسان ڕووبەڕووی یەکدی بووینەوە، ئەمجارەیان زوو لەسەر ڕووی خۆی هەلاّویشت گووتی!(کەشەو ڕاکشا وەرە ناو ناندین کارم پێتە).. ڕانەوەستام

وەرامم نەداوە، ڕاست ڕۆیشتم چوومەوە ژوورەکەی خۆم، چراکەم داگیرساند، مەقەرەی خەڵوزم ئاگردا.. کە ئاگرەکەی گەش بووەوە کتلیەکەم خستەبانی،بەدیاریەوە نقوومی خەیاڵبووم..!! ئەوە قەت زینۆخان نەبوو بەزمانی خۆی پێمبڵێ: وەرە ناندینێ، دەبێ چی وای لە زینۆ کردبێت ئەوها هێمن و لەسەر خۆو دڵنەرم بووە، باشە دەبێ بە نیازی چی بێ..؟!

..لەگەڵ هەڵچوونی چایەکە دێمی دابوو ڕاچڵەکیم.. ئیدی بەدەم چایخواردنەوە تێما بووم، هەر بۆ خۆم دەمگوت:

(نازانم برِۆم، نەرِۆم، دەترسێم برِۆم پەندێکم پێبکات، ئاخر من بەحەسرەتبووم بەس بمدوێنێ، کەچی ئێستاکێ بە خۆی جێ ژووانم بۆ دەست نیشان دەکات)..من لەم خەیالاّنەدا بووم تەقا لە ناکاو دیتم ئاسیا بە ژوورکەوت، حەزی لە گاڵتەو گەپ بوو، تەشقەڵەی پێم دەکرد. دەیگوت:یاڵلاّ دەستان بکەوە..دوای هەندێك دەست گەمە، هەریەکەو چایەکمان خواردەوە پاشان گوتی درەنگە دەرِۆم، بەبیانووی ئاوهێنان خۆم

لـه دایکـم دزییـەوە، ئـەگینا میوانـان هـاتبوون ئێسـتا چـاوەڕێن.بۆیـە دەبـێ بڕۆمەوە)..هەستا ڕۆیی.

..شەو بەدرەنگدا کەوتبوو، دڵم کەوتبووە قرت و پرت،هەرچەندی دەمکرد خەوم لێنەدەکەوت، نەدەحەجمام.. ئەسڵەن نەدەکوتمە نـا و جـێ.. دوا جـار هەسـتامەوە هندامی خۆم ڕێکخستەوە خۆم تەیار دا، لە دڵی خۆم بڕیارم دا..!

بـڕۆم بـۆ ژووانـی زینۆخـان.. پاشـان تێفکـریم، باشـە ئەگەرچـووم و لـە ژووانـی ژووژکانی دانام. ئەمەیان چەندی بەچەند..؟! نەخێر واچاکە ئارام بگرم، لەسەر پـەتك و سـنگی خـۆم دانیـشم چـاترە، لـەم تێکـەو لێکەدانـەوەدابووم، گـوێم لـە تەقـەی دەرگابوو،واقورمـام..لناسـیا هێـواری بەدرەنگـەوە لێـرە بـوو،دەبێ کـێ بـێ بـەم نیوەشەوە..؟! دیسان گوێبیستی تەقەی دەرگا بووم، دەنگم هەڵێنا..!

- کێیە لە پشتی دەرگا.؟!

- منم.زینۆ..زوو بیکەرەوە. نەبادا یەکێك ببینێ.!

..دڵم داخورپا، بەپەلەپرووزە دەرگام کردەوە، خۆی فجوری ژووری کرد، بە پەلـە دەرگام پێوەداوە و شمشێرەم ڕەپێشکرد.. دیقەتم دا زینۆخان، هەمووگیانی دەلـەرزی، تاوێ هەردووکمان دەممان ببووە تەڵەی تەقی، بەهەرحاڵ

پێمگوت: فەرموو دانیشە..! دانیشت، .. دیاربوو شەرم دایگرتبـوو پەشـۆکابوو ئارەقەی دەردابوو،

..لەشەرمان یاری بەپەنجەکانی دەستی دەکرد، پێمگوت:

- بەخێر بێ ی زینۆخان.! بەشەرمەوە گوتی:

- خودا سەلامەتت کات.

..پاشان زۆر بە نەزاکەتەوە لە بەرانبەریدا چۆکم گەیاندە عـەردی تـاوێ سـەیری چـاو. و ئـەبرۆ و گـەردەن و زوڵـف و پەرچـەمی زینـۆم کـرد. لـە دڵـی خۆمـدا گـوتم (سوبحانەللاه جوانە) . دواتر لێم پرسی

- ئەوە خێر بوو زینۆخان بەم درەنگی شەوەهاتی.؟!

لەبەرە خۆی کەمێك گرژییەوە وەپاشان گوتی:

- لە هێوارێوە چاوەڕوان بووم کەچی هەر نەهاتی..

هاتووم دوو قسانت لەگەڵ بکەم.!

- ڕاست دەكەی سەر لە هێوارێ گوێبیست بووم، گوتت: وەرە ناندینێ.
داوای لێبوردن دەكەم لێم مەگرە، چوونكی وامزانی هورێنەیەو هیچی تر.
- ئای مەكرۆ، چەند پیرۆنەی. بزانە كوو خۆت لە گێلی دەدەی..دەتەوێ دەستخەرۆم دەی.. گوایە من نازانم ئاسیا لە خشتەی بردووی كەست وەبیر نەماوە..
چمە من نازانم ئاسیا لە هێوارێوە خۆی لێرە نابوو.. ئاسیا پەردەی لە ڕووی خۆی داماڵیوە شەرم ناكات و هەركەسێك پێی بڵێ : مەرحەبا.. بێ لێكدانەوە دەڵێ سەر چاوم، ئافرەت بەم جۆرە ڕەفتارانە خەڵك بە چاوی سووك سەیری دەكەن ..من نالێم ئاسیا داوێن پیسە، نەخێر، بەلام ڕەوشتی ئەوهایە وئەگینا تا بلێی خاوێنە. كەچی خەڵك حسابێكی دیكەی بۆ دەكەن.. لە زاری ژنانەوە بیستوومە دەلێن:
(كیژەكی سووك و چرووك و چاو لەدەرە).. حەمەگیان..! تۆ پێتوایە كە (من) تۆم خۆشناوێت، نەخێر وانیە، بڕوات بێ تۆم لە گیانی خۆم پتر خۆشدەوێ، بەلام دەتەوێ من وەكو ئاسیا پەردە لەڕووی خۆم داماڵم .. ئا حەمە گیان،
حەیا گرانە بە كڕین نایەت، ئەوە لە من ناوەشێتەوە.. دەزانم بۆیە دڵت لە سەرە من ساردبووە، ناحەقت ناگرم، چونكی زۆرم جەزرەبەدای، وانییە..؟!
ئێستاش بۆیە هاتووم پێت بلێم..! كچ زۆرن لەم شارە، دەتوانی بە ئارەزووی خۆت كچێكی شۆخ و شەنگ و جوان و ئاسك و نازداربۆ خۆت دەست نیشان بكەی..
بەلام حەز ناكەم خۆت بخەیتە داوی ئاسیا.. نازانم ئەم جادووكەرە نووشتەی لێكردی چبوو..؟ چزوو دەستەمۆی كردی تێناگەم..؟!
تۆ هێشتا نایناسی، وەكو پشیلەی سپڵە وایە..ئێستاكێ خۆشم ناوێ، چونكی خیانەتی لێم كرد.. ئێمەدەستە خوشك بووین. قەت نەدەبا ئەوەم لە گەڵ بكات، مادام خیانەتی لە من كرد بێگومان خیانەت لە تۆش دەكات، بۆیە حەزناكەم داوی خۆت لە داوی ئاسیا گرێ بدەی.!
-زینۆخان..ئەگەر بەخت یارنەبوو، ئەگبەتی سواری شانی مرۆ دەبی.. من لەمێژە لە كانگای دڵمەوە نازدارێكی شۆخ و شەنگ و ڕەوشت بەرزم دەست نیشانكردبوو.. بەلام بەخت و یەغبالی من بوو.تابلێی: دڵڕەق و بێ بەزەیی و كەم دوو بوو، هەر ئەم دڵڕەقیەی (ئەو) بوو ناچاری كردم بۆ هاودەمێك، هاوخەمێك هەركەسێك پێمبڵێ مەرحەبا..! دەستەمۆی بم.

- نا حەمەگیان. لەوانەیە هێندە دڵرەق و بێ بەزەیی نەبێ. وەك ئەوەی تۆ تێیگەیشتوی.. نا نازیزم من دڵرەق نیم، هێواران تادەهاتیتەوە دڵم هەزار ڕێی دەکرد.. چاوەچاوبووم تاکو دەهاتیتەوە.. کاتێ لێم بەدیار دەکەوێ دڵنیا دەبووم.. تۆ نازانی حەمە گیان. ئەم خەڵکە هەمووی دڵرەش و ژەنگنن.دڵیان کرمی کەوتووتێ. بەزەییان بەکەس دا نایەتەوە، ئەگەر ئەم ترسە نەبێ..! کوو دێڵم دەستەمۆی یەکێکی دیکە بی، خۆ من دەزانم لە ڕکابەری من بوو دەستت لەگەڵ ئاسیا تێکەڵ کردووە، ئەگەر وانییە..؟! بڵێ نەخێر وانییە.

- بڵێم چی زینۆخان..؟! من هەر لە منداڵیەوە بەدبەخت و چارەڕەشم ژیانم هەمووی قوزەڵقورت و زەقنەبوتە، لە ژیانمدا تەنها جارێك چییە..؟! لە دەروونەوە پێنەکەنیووم، کەسێك نەبووە دوو قسەی خۆشم لەگەڵ بکات.. بۆ ئەگبەتی لێرە گریان هەوکی گرتم نتقم گیرا.. زینۆ هەستاوە سەرپێ گوتی : وا دیارە ئێستا زینۆت خۆشناوێ. ها.؟!

- زینۆم پتر لە گلێنەی چاوم خۆش دەوێت.

..داچەماوە هەردوو دەستی گرتم قیتی کردمەوە هامێزی تێوەرینام. توند لە باوەشی خۆی گرتم، تاوێکی خۆش پێکەوە هەژاینەوە، پاشان بە ئەسپایی خۆی کێشاوە دواوە گوتی: (بەرمدە بابرۆمەوە درەنگە نەبادی..)

..دەرگاکەم کردەوە لەپێش(ئەو)چوومە دەرەوە، سەحی ئەملاو ئەملام کرد. دنیا کشومات،بێ هەست و خوست بوو بە هێواشی بەرێمکرد ڕۆیی، هەتا گەیشتە ناو حەوشەی ماڵی خۆیان سێرەم لێگرتبوو، پێش ئەوەی بچێتە ژووری ئاورێ لێدامەوە دەستی هەڵشەقاند.. پاشان چوومەوە ژووری، دەرگاکەم پێوەداوە،شمشێرەم ڕەپێشکرد، شاد و شەنگۆڵ و ئاسودە بووم، لەسەرپشت لێراکشام، هەر خۆم دەزانم چەند بەختیارو بەختەوەر بووم، لەوە بەختەوەرتر چی هەیە..؟! زینۆ دەرگای ژیانی بۆم کردەوە، خۆشی ئەو خۆشییە بوو لەو شەوەدا من تێدا بووم..

(ئێستاش زۆرجاری وادەبێ شەوان بەیادوەری ئەو شەوە دەخۆمەوە)..ئیدی نازانم کەنگێ خەوم لێکەوت لە خۆشیان..

وەکو بەرخی تێرشیر کەوتبوومەخەوێ..

# بەشی یازدەهەم

..سبەینەی ڕۆژی ئاینـدە بەخەمـدا کـەوتبووم، هەرچـەندی بـیرم لێـدەکردەوە نەمدەزانی بە چ ڕووێك..؟! ئاسـیا حـاڵی بکـەم پێـی بڵـێم ئاسـیا حـاڵ و حـساب ئەوهایە، دەترسام نەبادا ئاسـیا لـە ڕقـان هـووردو درشـتی حەسـاریٚ تێبگەیـەنیٚ زینۆخان سـووك و چروك و ڕیسوای بکات، ئەمەیان چەندی بەچەند..؟!

ئیٚ خۆ ناکریٚ کوتك و سینگی پێی بڵێم برۆ وازم لێبینە.

..نا هەرگیز لە ڕووم نایە ئاسـیا دەربکەم. ئاسیا خەم ڕەوێنم بوو، لە دڵم نایە لەگوڵ گرانتری پێبڵێم.. مرۆ نابیٚ هێندە سپڵە و نـەك حـەرام و هەڵپـەرست بـیٚ، من:قەرزاری ئاسیام.. ئاسیا لـە کـاتی تەنگانـە و لێقەومانـدا دەسـتباری دەگـەڵ گرتم، شەوان وەك فریشتەی فریـادڕەس ئاسـای دەهـات، هـەردوو بـاڵی خـۆی بـۆم ئەوی دەکرد هەڵیدەگرتم، لە شەقەی باڵی دەدا بۆ دنیایکی تـر دەیـبردم، دنیایـەك بوو لێوان لێو بوو لە خۆشەویستی.. لـەم خەیاڵانـەدا بـووم. لەگـەڵ دەنگـی (مـام ئۆمەری سەوزە فرۆش) ڕاچەنیم..!(حەمە..هۆو.. حەمە دەوەرە کوڕم ئەم زەمبیلە بۆ ئەفەندی هەڵگرە، بەخۆی پێناوەستیٚ هەڵیانگریٚ) .. باشە واهاتم.

..لەو سـەرکە گەڕامەوە،لەپڕ ڕووبەڕووی پوورە ئامینـەی دایکـی ئاسـیا بـووم لێم پرسی

- پووریٚ چۆنی.؟!

- وەی پوریٚ بە قوربانت بیٚ کوڕی خۆم.. باشم شـوکر، دوعـای خێروخۆشـیت بۆ دەکەم.

..کیسـەیەك چوکلێتی بەدەستەوە بوو. بە پێکەنینەوە لێم پرسی ؟

-پووریٚ وێدەچیٚ مەولود خوێنەوەو هەبیٚ.؟!

: له سەرە خۆ گرژییەوە گوتی:

- ئەم چوکلێتە بۆ شیرنایەتی ئاسیایە، بە بۆنەی بەدەزگیران بوونی.. دوێنێ شەو مارەمان کرد.

- خودا پیرۆزی بکات لەسەر خێران.

- بێوەی بی کورم، ئینشەڵلاّ ئەوها شیرنایەتی بۆ کوری خۆم دەبەشمەوە.. ئازابە باکۆزت ساوانەبێ.!

پێکەنیم گووتم: خودا کەریمە پووریّ.

..ئەوە مژدەیەکی خۆش بوو. پوورە ئامینە حەقی مزگێنی کەوت.لەوەش خۆشتر ئەوەبووکە هێواریّ چوومەوە زینۆخان لەناو حەوشەی خۆیان راوەستابوو چاوەروان بوو، لە دووراودوو.. سلاّوێکی عاشقانەم لێکرد.. دیاربوو سەری دانواند، بەسەر وەرامی دامەوە، ئەوە یەکەمجاربوو زینۆخان وەرامی سلاّوم بداتەوە. لە خۆشیان خەریکبووم باڵبگرم.. ئیدی بەرەبەری ماڵنوستنان، هاکادیتم ئاسیا وەکو فریشتە پەیدا بوو، هیچ خۆم لە گورەنەبرد.. هەتا شل و کەت بووین گەمەوگاڵتەو دەستبازیمان کرد.. دواتر ئاسیا لە تریقەی پێکەنینی دا گوتی:

- دەزانی بە جێت دێڵم..؟! بەلاّم بەر لەوەی ماڵ ئاواییت لیّ بکەم چەند قسەیەك هەیە حەزدەکەم پێت بڵێم.. پێداچوو گوتی (حەمەگیان تۆم خۆش دەویّ، کورێکی بەشەرەف و رەوشت بەرزو داوێن پاکی.. زۆر چاك دەزانم

گرفتاری دوو چاوی مەنگی زینۆی، من و زینۆ دەستە خوشك بووین، جارێکیان بە ئەنقەست پێمگوت: کچیّ بابان کۆر، چتداوە لەم کورە هەژارە، کەس نەبوو لەم شارە دڵداری لەگەڵ بکەی ملی ئەم هەژارەت گرتووە، بابان کۆر چمە ئەم کورە خۆی پیّ تێر دەکریّ هەتا دوا رۆژی تۆ دابین بکات.. زمانم بەبرین چی، من هەر ئەوەندەم گوت.. کەچی ئەو شێت وهار بوو. هەرچی قسەی سووکو چرووکو ناشرینە، لە بەردەمی سەگ رووی بکەن بۆنی ناکات، ئابرووی بردم، ئیتر لەو رۆژەوە لێم لالوتە، لێم لە رق راچووە ئامدوێنیّ، بەلاّم زینۆ کچێکی هۆشمەندو کارامەیە، گران و سەنگینە،زۆر بە هوردەیە، بەووردی لێکدەداتەوە، زۆربە ئەسپایی و شێنەیی هەنگاو هەڵدەگریّ،بە ئاسانی دەستەمۆ نابی،. نازانم

بۆچی ئەم کچەم هێندە خۆش دەویێ..؟! بۆیە حەمەگیان حەزدەکەم خۆتی لەگەڵ ماندوو بکەی.. تۆ وەکو من نایناسی، هەر من دەزانم چتۆ کەللە ڕەقە، بەسەرە خۆی ناهێنیێ، ئەگینا هەرگیز ڕاست ناکات، من دەزانم هەناوی پڕ ئاگرە، بونکرووزی لێدیێ،قەت وانەکەی لە دەستە خۆتی بدەیی، باشە.؟!

- سوپاست دەکەم ئاسیا، قەت نەمدەزانی هێندە دڵ ساف و میهرەبان و بەبەزەیی، منەتباری تۆم ئاسیا، شەرت بێ هەتا لەژیاندا مابم هەرگیز لە یادت نەکەم.. دڵنیا بە ئامۆژگاریەکانت فەرامۆش ناکەم، ئاسیا گیان، من قەت لە چاکەی تۆ دەرناچم، خەمم ئەو خەمەیە چاکەی تۆ بە من نەدرێتەوە. پێکەنی گووتی:

- ماڵوێران چەند ڕەزیل و قرچۆکی. لە هێواریێوە بە سەر زمانت دا نەهات پیرۆزبایم لێبکەی.!

- نەخێر ڕەزیل و قرچۆك ئەو کەسەیە بەدەستی واری سەردانی خەڵکی بکات، هیچ لەگەڵ دەستی خۆی نابات.!

: لە قاقای پێکەنینی دا، چەند دانە چوکلێتی لە گیرفانی (کەوا) کەی دەرێنا گوتی(دەها بگرە دەمت پیێ شیرن بکە.

- ئاسیاگیان، لە کانگای دڵمەوە پیرۆزبایت لێدەکەم، هیوادارم خۆت و دەزگیرانەکەت لەژیاندا بەختەوەر بن، هەردەم شادو کامەران بن.

-سوپاست دەکەم حەمەگیان، دڵنیا بە قەت لە بیرت ناکەم،

..هەستاو خەریکبوو بڕوا، توند مەچەکم گرت. هیچ خۆی شێلونەکرد، بە ئەسپایی نێو چەوانم ماچ کرد، چاوی پر فرمێسك بوو، پاشان بە هێواشی ڕۆیی بەجیێ ی هێشتم..

# بەشی دوازدە

.. باوکی زینۆخان، چەرچی مەڕومالاّت بوو،جاری وادەبوو دەڕۆیی بۆ هەواری خێڵەساتی دەوار نشین لە زۆزان.دە، پازدە شەوی پێدەچوو.. زینۆ ڕێوشوێنی بۆم دیاری کردبوو، تێیگەیاندبووم درەنگانی شەو دزەم دەکرد، دەچوم بۆ جێی ژوان لە ناو ناندین یەکدی گر دەبووین.. وەکو ساوا خۆم لە باوەشی مات دەکرد، باوەش هێندە گەرم و نەرم و خۆش بوو هەستم لە خۆم دەبڕی.. جاری وابوو لە هامێزی دەبۆرژام، هێندە خۆش بوو هەستم بە دلّنیایی دەکرد. زینۆخان دەستی لە کاکۆلّم وەردەداو دەیدواندم، بەلاّم زۆر بەهووردە پرسیار بوو، شەو نەبوو پرسیارم لێنەکات، شەوێکیان ناچاری کردم باسی ڕەچەلّەك و ڕابردووی خۆمی بۆ بکەم.. منیش لە سیری هەتا پیوازی، وەکو هێلکەی سپیکراو هەرچی لە دلّم دابوو بوخچەی دلّم بۆی کردەوە.. کە باس گەییە زڕدایکم..! لە قاران گریان قورقوراگەمی گرت نتقم گیرا قسەم بۆ نەکرا،نەخێر، وەکو مندالّی ساوا نزگرەم گرتبوو لێوم بە تەتەلّە کەوتبوو، زۆر بە خۆمدا
شکامەوە، هەستامەوە ڕاست ڕۆیشتم، لە دلّی خۆمدا دەمگوت: بزانە چیم بەخۆمکرد، نازانم بۆچی باسی ئەو نەفرەتیەم کرد..؟! ئەو جادووکەرە بە خۆی بە دێوم و نەگریسە ئەسلّەن پێی ڕەشە، وەکو (کوندەبۆ) ئاسای لە هەر کوێیەك بنیشێتەوە، بێگومان وێرانی دەکات چونکی بلح ونارچاخ وشوومە ناو هێنانی پەسند نییە..

.. باوکی زینۆ هێشتا مووی سپی نەکردبوو چاو کراوەو قسەزان و بە سەلیقەو ڕوێکی خۆشی هەبوو،لە کاتی تەنگانەدا هەرگیز هەلّنەدەچوو شێلونەدەبوو، مرۆیەکی ڕێزدار بوو لە لای دانیشتوانی حەساریّ خۆشیان

دەویست..

هێوارانی هاوینێ دوای نوێژی شێوان پێش ماڵی باوکی زینۆ هەتاکو درەنگی شەو، وەکو دیوەخانی (ئەسعەدی فەتاح بەگی هەرکی) وابوو، بە قسەی خۆش و پێکەنین و هەقایەت و سەربردە ڕایانادەبوارد.. زۆر جاری وادەبوو تکایان لە (خاڵە هەباس)دەکرد بۆیان بگێڕێتەوە، لە کاتی خۆی چۆن..؟! بووك (مریەم)ی هەڵخەڵەتاندو هەڵیگرت بۆ خۆی هێنای، خاڵە هەباس و بووك مریەم، هەردووکیان بەناوساڵدا کەوتبوون، ئەگەرچی نەوەیان نەبوو، بەناو ساڵیشدا کەوتبوون بەلآم لە ژیانی خۆیاندا زۆر بەختەوەرو کامەران بوون، هەستیان بەپیربوون نەدەکرد چونکە لە دەروونەوە یەکدیان خۆشدەویست..

# بەشی سیزدە

..خاڵە هەباس،چاوی بەملاو ئەولادا دەگێڕا، دواتر پێدەکەنی دەپرسی

- کوڕگەل خۆ بووك مریەم لەم نزیکانە نییە.؟!

- نەخێر لالۆ، بێ خەمبە دیار نییە.

.. پاشان زەردە خەنەیەکی شادمانی بەسەر لێوی دادەهات دەیگوت ٠ دایکوبابم زوو سەری خۆیان نایەوە، منی نۆیەرە بە هەتیووی لە ماڵی مامم داڵدەیان دام، کاتێ لە هەرەتی لاوێتی دا بووم،مەملەکەتی ئێمە لە دەشتی هەولێر، دووچاری بێ بارانی و هیشکە ساڵی و قاتوقڕی دەغلێ و دان بوو، مزاش چییە..؟! نەبوو بیخۆین..خەڵك بە گوێدرێژو ولاخی بەرزە قەسپ و خورمایان باردەکرد دەیانبرد بۆ مەرگەو پشدەرو دەشتی بیتوێن، لە دێهاتەکان دەگەڕان قەسپ و خورمایان بە گەنم جۆ و جۆ سپیلکە دەگۆڕییەوە.. مامم دوو نێرەکەری هەبوو منیش بەکرێ بۆ کابرایەکی گوندی خۆمان بارم دەکرد، لە گەڵ کاروان چییان قۆناغ بە قۆناغ پێدادەچووین، قۆناغێکمان لە ماڵی بوك مریەم بوو لە گوند.. بارمان لێبەعاردی دادەدا..(هەموو جارێ خاڵە هەباس لێرە ئاهێکی ساردی هەڵدەکێشا).. پاشان دەهاتەوەگۆ دیگووت.. بووك مریەم..؟! سواری لە سەر زینی دەهێنا خوارێ، هێندە جوان و شۆخ و شەنگ و ڕەندو قۆزو دڵتەڕو دڵبەر بوو، مەپرسن.. منیش گەنجم. گەنجێکی کۆك و خورت لە هەرەتی لاوێتی دا بووم.. لە کێندەر پسابووایە گرێم نەدەداوە، چاوم بە بووك مریەم کەوتبوو ڕۆحم بۆی نەمابوو، کە تێفکریم..!

بووك مریەم زۆر مەشرەف خۆش لە بار بوو، بە هەرحاڵی هەبوو سەرنجی بووك مریەمم بە لای خۆمدا ڕاکێشا..

(خاڵە هەباس هەموو جارێ کە لە گێڕانەوەی سەربردەی خۆی و بـووك مریـەم دەگییە ئێرە. لە تریقەی پێکەنینی دەدا) دەیگووت: کوڕینە، بە درۆ نەیانگوتووە ژن ئەقڵی لە کۆشیدایە، هەرکە هەستاوە سەر پێ هەرچی لـە کۆشـیدایە ئێـی بـە گۆڕێ وەردەبێت). پاشان تێهەڵدەچوو دەیگووت:

..بووك مریەمم واتێگەیانـدبوو، دوو گونـدمان هەیـە، سـێ کـارێزو چـەندین جۆگەی ئاومان هەیە، چەند شوانکارەمان هەیە.. جووتە هێسترمان هەیەو. ئیدی بۆم تێکوشابوو بەهارم هێنابووە چۆکان..(پێدەکـەنی دەیگـووت: قـەت جـارێ لـە جاران نەیپرسی مادام تۆ کوڕە کێخوای دێی چیت داوە لـە کـەروکاروانی..؟! یـان بپرسی بڵێ: مادام ئەم هەموو جووتە هێسترانە و هەیە بۆچی ئەم دوو کەرە پـشت کولەت دایتە پێش خۆت).؟!

..ئیدی بەم قسە زلزڵانـە هـەڵم خەڵەتانـد لـە خـشتەم بـرد کـوو لەگـەڵم بـێ هەڵیبگرم ڕازی بوو.. وابوو تەگبیرمان کرد لە فلانەڕۆژی خۆی ئامادە بکات. لـە نیوە شەودا دەستی بگرم و بـۆی دەرچـین.. لـە گونـدی خۆمـان بـرادەرێکم هـەبوو ئەسپێکی چاکی هەبوو، ئەسپەکەم لێخواستەوە.. تاریکو ڕوونی بەیانی لێی سوار بووم بازۆ.. بیتوێن خۆت بگرە واهاتم، دوای چەند قۆناغـە ڕێ پـاش عەسـرانێکی درەنگ گەیشتمە ئاقاری گوندی بـووك مریـەم.. پـێش ئـەوەی بگـەی بـە ئـاوایی چەمێکی لێبـوو، لامـدا ناوچـەمەکە، هـەتا شـەوداهات، دنیـا تاریـك بـوو، کـە تاریکی کەوتە عاردی هەوساری

ئەسپەکەم گرت بە دوای خۆمدا رامکێشا، لە نزیك کانی ژنان لە بنە دارێـك بەستامەوە. توورەگەی ئالیکم بەسەری وەکرد، پاشان سێرەی نیگام گرتە ڕێگـەی نیوان ئاوایی و کانی ژنان چاوەڕوانبووم..

## بەشی چواردە

..دڵم کەوتبووە قرت و پرت.دوو دڵ بووم لە دڵی خۆمدا دەمگووت: ئەگەر نەهات، تەگبیر چییە..؟! لەم خەیاڵانەدابووم، دیتم...لبووك مریەم پریاسکەیەکی بەدەستیەوە گرتبوودەهات، هێشتا مابووی بگاتەلام، بۆ دڵنیا بوون لە جێوە کۆکیم .. پاشان بە پیریەوە چووم پریاسکەکەم لێوەرگرت، دەستم گرت ڕۆیشتین بۆ لای ئەسپە شێ ..

دووپشتەکی لێی سوار بووین لێخوڕە..هەتا ئەو کاتەی سەگ و گورگ لێکدی ئاشکرا دەبن، لە ڕاستەڕێدا هاژووتم، پاشان لاماندا ناو دارستانێکی چڕوپڕ دابەزین،ئەسپەشێم لە بنەدارێك بەستاوە و ڕستم بۆی درێژکرد تەورم دا، بە ماشای خۆی دەلەوەڕا.. بووك مریەم پریاسکەکەی لە پێشەخۆی دانا گرێکانی کردەوە نووردیەك نانی لە ناو پارچە پەڕۆکێك پێچابوو، دووسەڵکە پەنیرو لەگەڵ هەندێ خورما قاوەڵتیمان پێکرد.. لەسەر پشتی وڵاخ زۆر ماندوو، شەکەت ببووین، بەتایبەتی من تەواو پەکم کەوتبوو، خۆم بۆ ڕاندەگیرا، ترس و خەو بەسەرمدا زاڵ ببوو بڕستی لە بەرم بڕی بوو،. چار هەرئەوە بوو بە نۆرە چاوی خۆمان گەرم بکەین.. لە پێشدان مریەم پاڵیداوە سەر خەوێکی خوشیکرد، لەخەوێکی شیرین دابوو، بانگم نەکرد، دواتر بە خۆی بە ئاگا هات.، هەر لە جێوە نیوە ڕاست بۆوە و زەردەخەنێك بە سەر هەردوو قەیتانی لێوی داهات گووتی، پاڵکەوە چاوت گەرم بکە.

.. پاڵم داوە،وەختێك لەگەڵ فڕمەی ئەسپە شێ وەئاگاهاتم، خۆر بە تاقی ئاسمانەوە بوو.. بووك مریەم هێشتا هەر دانیشتبوو.. هەستامەوە پژدێنم توند کردەوە، پاشان چووم بە ناو دارستاندا گەڕام و سوڕام هەندێك مێوەی کێویم ڕنی

هێنام خواردمان، هەتاکو نێواریٚ دنیا ئەنگۆرە بوو هەر لەویٚ ماینەوە.. کە تاریکی کەوتە عاردی، دیسان دوو پشتەکی سوار بووین باژۆ، لە ڕێگا ناوە ناو دادەبەزیم بە پیادە دەڕۆیشتم.. لەبەر ئەوەی دەترسام، ترسم لە ئەسپی تاین بوو چونکە فێرە ڕۆینی ناو شاخ و بەردەڵان نەبوو، زۆریش ماندوو بوو جاروبار ڕەتی دەبرد، دەترسام پەکی بکەویٚ.. تەنها لە هەورازە ڕیٚ ئەگینا کە بە نشێودا دەکەوتین، دادەبەزیم، بە زۆری پیادە ڕۆ بووم. ئیدی بەم چەشنە بە شەو لێخوڕە بە ڕۆژ خۆمان مات دەکرد .. هەتاکو ئەو بەیانییەی لەشاری هەولێر ڕەتماندا گەیشتینە سەر جۆگە ئاوی میری. خۆر وەبانان کەوتبوو دابەزین.. دەستو چاومان شوشت، پێمگووت: ئەم جۆگە ئاوە هی باوکمە.. دوای پشوودان بووك مریەمم سوار کرد بەڕێکەوتینەوە کەلە گردی (کلك مشك) ڕەتبووین لە ئاقاری گوندی

(باغە منارە) مێگەلە مەڕی (حەسەنی سالحەسۆری) لە ناو پەرێز پەرتەی لێکردبوو دەلەوەڕان، گوتم بووك مریەم ئەم ڕانەولاتی ئێمەیە.. بەر لەوەی بگەینە ئاوایی جۆگەی میری لە هەولێرەوە دەهات کەوتبوە خۆرهەلاتی گوندی باغەمنارە، شارستان لە هەولێرەوە دەهاتن شینابیان لەبەردەکرد، پێمگووت: ئەم جۆگە ئاوەش هی باوکمە، شینابییەکەش باوکم بەنیوەکار (جۆوان) ی بۆ گرتووە بەناوی دێنیٚ، دواتر بە دەست ئاماژەم بۆی کرد..! هەها.. بووك مریەم ئەو حەسارێهێت دیوە..؟! ئەوە حەساری باغەمنارەیە، باوکم کێخوای ئەم گوندەیە..ئێرە گەرمیانە. گەرمیان زۆر خۆشە، هەر هێندەت زەحمەتییە تاکو لێڕادێی،ئەم هەموو قسەیەم بۆی کرد، دار قەرەشت،بەرد قەرەشت، بەلاٚم

مریەم دەنگی نەبوو.. ئیدی هەرئەوەندەم خۆشی بوو تاکو گەیشتینەجیٚ،کافر بە حالّم نەبیٚ لە دەست مامم..! کاکە نازانم چت بۆ بگێڕمەوە..؟کە مامم چاوی بە مریەم کەوت، توند بن پیلمی گرت ڕاکێشامە پەنا دیواری، وەختبوو

لە بنڕا پیلم هەلّتەکێنیٚ پێی گووتم:

-سەگی سەگباب پێمبلیٚ ئەم کیژە چییە. کیژی کێیە.؟! دەنگم نەکرد ..گووتی:

- دەی سەی کوڕی سە، پێمبلیٚ کوو ئەم نازدارەت هەلّخەلّتاند، چۆن سەرت

لە قورڕێنا.؟!

سەری خۆم بەردابووە وە لێوم نەقەرەشت.. شێت وهار بوو ڕایتەکاندم گووتی:

- دەی دەیوت باب لۆ قسە ناکەی.؟!

- چما تۆ دێلی قسان بکەم.. تۆزێ نارام بگرە بوارم پێبدە.!

- دەباشە دەی کوڕی سەگ. بزانم چ شەکرەکی دەشکێنی.!

.. دە قسان بکە حیز باب دەی .!

.. لە سیری هەتا پیوازی هوردو باریك هەرچی هەبوو بۆم گێڕاوە.. هەردوو دەستی لێکدا. لە جێوە پشتی دا دیوارو هەڵکوڕما، هەر لە بەرە خۆی بۆ خۆی دەدوا دەیگوت (ئەو گۆڕ بە گۆڕە..(مەبەستی باوکم بوو).. بۆ خۆی مرد بە ئیسراحەت سەری نایەوە، فەرموو چ بەلایەکی لە دوای خۆی بۆ من بە جێهێلاوە، نازانم سەری خۆم بۆ کێندەر هەڵگرم..؟! دوژمنداری بەمن دەکرێ،کەی تاقەتی دوژمنکاریم هەیە، من نینۆکم نییە خۆمی پێبخورێنم، نۆبەتی دوژمنداری یە)

.. مامم شێت و هار ببوو. سەری دنیاو بنی دنیای لێ وێکهاتبۆوە.. هەردوو دەستی لە ئەژنۆی وەرێنابوو پرتەو بۆڵەی بوو نەی دەبڕیەوە .. بەلام هەرچی مامۆژنم بوو، خۆی لە گورە نەبرد، زوو لە بووك مریەم ڕووهات، ئەملاو ئەولا ڕوومەتی ماچکرد، دەستی گرت بردی لە ژووری داینا.. پاشان مریشکێکی سەرەمری گرت لە عاردی دا. هەر بە خۆی سەری بڕی،نازانم لە چ قوژبنێك دوو گۆڵم برنجی شاردبۆوە . لە ناوێی کرد سەر پشتی لێبەستابوو دەهاتوو دەچوو خەریکی چێشت لێنان بوو، ناوە ناو ڕووی لە بووك مریەم دەکرد پێی دەگووت(یاخوا بەخێرێی سەر هەردوو چاوی مامۆژنت هاتی، مالکەمانت ڕۆناك کردەوە).. مامۆژنم نافرەتێکی چاو کراوەو دلفرەوان و میهرەبان بوو.. بەلام هەرچی مامم بوو مرۆیەکی(بێن) تەنگ بوو، زوو پشی هەڵدەما،بە گۆڵمە ئاوێ بە مەڵەوانی دەکەوت چرتەی دەهات.. مامم هێشتانەکێ هەر پرتەو بۆڵەی بوو نەیدەبڕیەوە.. مامۆژنم بەرانگژی بۆوە لێی ڕاست هات باگۆی داوە..! (ئەوە چ بۆڵە بۆڵو ترمە ترمتە..شەرم ناکەی..؟! دەڵێی پیرژنی دۆت لێرژاوە.. دەککە داوەشێی زەلام،کوونتەی بەرداوە.. ئیش ڕوونەدا بەلام کەڕوویدا بە خێرێ، ئیدی

ئەو منجە منجەی بۆ چییە.)؟!

..هێواریّ دوای شێوکردن. بووك مریەمِ زۆر عادزو غەمگین بوو، ڕەنگی ڕووی پەڕی بوو. تێگەیی بوو ئەو قسانەی من بۆمکردبوو هەر هەمووی درۆبوو، لە قاران هۆن هۆن فرمێسکی بەردەداوە.. خەفەتباربوو.. مامۆژنم هەولّی دەدا هەر چۆنێکی هەبیّ دلّی بداتەوە، بە شێنەیی دەستی بەسەری دادەهێنا ؟ دەیگوت: (کچی خۆم دلّ لە دلّ مەدە تازە ئیشەکە ڕووی دا. کار لەکار ترازاوە،بێهوودەیە پێینـاویّ خـۆت سـەخلّەت بکـەی،ئارامت هـەبیّ بـزانین چـارەنووس بـە چـی دەگات)..باشبوو مـامۆژنم بـە قـسەی خـۆش هێـوری کردەوە،دیـار بـوو کـەمێك هاتەوە سەرە خۆی، چاوی هەلّهێناڕووی

لە من کرد گوتی: پێمنالّیی بزانم بۆچی دەستی منت لە قۆرتێنا..؟! قـەت شەرمت لە خۆت نەکرد، بـە خـۆت دەلّـی پیـاو.. پیـاو نـابیّ درۆ بکـات).. دار قەرەشت بەرد درزی برد، بەلاّم من منگـەم لێـوە نـەهات.. دیسان مـامۆژنم بـە بەریدا کەوتەوە..! (کیژی خۆم پێویست بەوە ناکات ئـازاری گیـانی خـۆت بـدەی، ئارامت بیّ پەنا بەخوا بەکەیف و ماشای تـۆ دەبـیّ، شـەرت بـیّ لـە سـەر چـاوی خۆمت دادەنێم، بەس تۆ عادز نەبی)..دواتر دیار بوو مامەم هات دەستی هاوێتە سەرسەری بووك مریەم پێی گوت: (کیژم تازە کار لە کار تـرازاوەو هـیچ نـاکریّ و هەرچی بکەی دادت نادات، چارت نیە، چار هەرنەوە یە سەری خۆمان پێکوەنێین، بزانین چار نووس بە چی دەگات.)؟!

(کوڕ گەل ئەم فرت و فێل و کەتنەم نەکردبایە..؟! بەم تەمەنە دەگەییم بـەبیّ هاوسەر دەمامەوە، بەلاّم ئەوە

سـالّە هـای سـالّە پێکـەوە دەهەژێنـەوە، بـڕۆن سـوێندی بـدەن، هـەتا ئـەم چرکەیەشی لە گەلّدا بیّ لە گولّ گرانترم پێنەگوتووە، سوێند دەخۆم لە جاران پـتر خۆشم دەویّ، هەر بەچاوی پێشان سەیری دەکەم ئیستەش شـەوان ئەگـەر سـەر بـە باسکی نەکەم، یەکدی لە باوەش نەگرین هەرگیز خەوم لێناکەویّ، چوونکە خۆشـم دەویّ)..ئیـدی بـەم قـسە خۆشـانەو سـەربردەی لالـۆ هـەباس و بـووك مریـەم شەوگارمان بە نیوە دەکرد، پاشان پەرتەمان لێدەکرد..

# بەشی پازدە

.. شەو درەنگ بوو،دواجار کەڵەشێر بانگی نیوەی شەوی ڕاگەیاند.. بانگدانی کەڵەشێر لە نیوەی شەواندا، لە ناو کوردەواری دا، واتای تایبەتی هەیە، دەڵێن: کە ژن لە ماڵە مێردی زیز دەبێ دەتۆرێ دەچێتەوە ماڵەبابی،بەلاّم سەر لە هێوارێ هەر چاوەڕوانە چوونکی بەتەمایە بێنەدوای بیبەنەوە..بەلاّم کەلە دەمەو ساتی نیوەی شەودا. گوێی لە سەدای بانگی کەڵشێر دەبێ بانگی نیوەشەو ڕادەگەیەنێ ئومێد بڕ دەبێ. ئیدی بە شلوخاوی کەلەکەی دەخێوێنیتە عەردی دەخەوێ)..هەستام چراکەم کز کرد، بە ئەسپایی دەرکەوتمە دەرەوە بە هێواشی خشیم خۆم فجوری ناو ناندینی ماڵی زینۆخان کرد.. هەستم لە خۆم بڕی چاوە چاو بووم، هەندەی پێنەچوو زینۆخان هات، بەلاّم چی هات..؟! ملوانکەیەکی قەنەفری لە ملی کردبوو، قامکەك ڕەیحانە ڕەشەی لە نێوان جۆگەی هەردوو مەمکی دانا بوو، بۆنی قەنەفرو ڕەیحانە ڕەشە لەم نیوە شەوەدا دەمار دەمار دەڕۆیی، دڵم وەکو کورەی ئاسنگەر جۆشی ستاندبوو.. بە خۆم نەوەستام هامێزم تێوەرینا تووند لە باوەشی خۆم گرت، دەمم نایە گەردنی هەڵم مژی..وێدەچوو لە حاڵەتی نەستی دا ئازاری پێگەیی بوو، بۆیە بە ئەسپایی پاڵی بەسەرمەوە نا.. لەڕاستی دا هەست وهۆشم لای خۆم نەمابوو، لەوانەیە چنگە چڕەم دەگەڵی کردبێت بۆیە گوتی:

- ئەوە چ بەلاّتە..؟!

.. بۆچی وا گەرم داهاتی..؟!

.. خۆ ڕاناکەم لە سەر خۆ بە.!

- بڵێم چی زینۆ گیان..؟!

..هەست دەکەم ئاگرێك لە دەروونم دا گڵپەی سەندوە، بۆیە لە تاوان ئاگام لە خۆم نیە داوای لێبوردن دەکەم.!

..دەستی چەپی هاوێتەملم لە خۆی نزیك کردمەوە، بە دەستی ڕاستەی دوگمەی یەخەی سوخمەو کراسی ترازاند، دەستی نایە ژێر مەمکی نەختێك بلّندی کرد گوتی: (دە بمژە بزانم بۆچی ئاورت گرتووە.؟!

..وەکو کۆرپەی ساوا خۆم بە سینگیەوە قرساندبوو، دەمم نابووە مەمکی وەکو زارۆی برسی پەیتا پەیتا دەممژی و بە دەست مرومۆم لە سینگ و مەمکی دەکرد، هەستم لە خۆم بڕی بووجولەم نەدەکرد: مامۆستا (یەشارکەمال) ی ڕۆماننووس دەفەرمووێ..!(مەمکی کیژان تووندو بچوکن، چۆن گەورە دەبن..؟! دەستی هەرزەکار گەورەیان دەکات، بە گرتن وگوشین گەورە دەبن، بە دەستیانەوە دەبنە(بەهێ) یەکی گەورەی توکداری بۆندار پیاو لە دیندەردەکات)..

زینۆخان بە مەمکەکانی ژێری کردمەوە، هۆشم هاتەوە بەر، دواتر بە ئەسپایی دوگمەی سوخمەو کراسیم بۆی داخستەوە، پاشان دووبارە هامێزم تێوەرێناوە لە باوەش خۆم گرت تاوێ بەبێ دەنگی یەکدیمان لە هامێز گرت پاشان پێمگوت: زینۆ گیان، دەزانی لەژیانی خۆم بێزارم.! تەنیا باڵی شەوان لە ژوورێکی ساردو سڕ بڕستی لە بەرم بڕیوە

سوخت و بێزاری کردووم، بە ئاواتم شەوێ لە شەوان بەسەرخەوێکی خۆشدا بکەوم خەوم لێبکەوێ چاوگەرم بکەم.. خەو چاوم دەگرێ دەبۆرژێم و نابۆرژێم بەئاگادێمەوە.. ئەوە دەردی تەنیا باڵییە، تەنیا باڵی دەردێکی کوشندەیە، هەرچەندی بیری لێدەکەمەوە بارم قورستر دەکات زینۆگیان..! ئەگەر تۆ دەستبارم لەگەڵ نەگری..؟! ئەگەر بە فریام

نەکەوی و لە ژێر ئەم بارە قورسە دادەچەمێم بە چۆکدا دەکەوم هەرگیز هەڵناستمەوە، دەڵێم..! ئەگەر ڕێگام پێبدەی بە مەرجێك پێ سەرگران نەبی..؟! حەزدەکەم..پێشی لێم گرتەوە نەیهێشت قسەم تەواو بکەم گوتی:

- حەمە گیان لە مەبەستت دەگەم، لە مێژە چاوەروانی ئەوەم لێت دەکرد، ئێستاکێ ئەگەر حەزدەکەی بێیتە داخوازیم..؟! قەیدی چییە وەرە با ئەوەشت پێ

بلێم..؟! شت لـە دایـك ناشـاردرێتەوە، دایکـم دەمێکـە پـێ حەسـیایە کیژەکـەی ڕاوگەی دانایتەوە، ئەوەپێش جارێکیان ڕاستەوخۆ پێی گووتم:

- زینۆ.! کوڕێکی چاکو ڕوەشت بەرزو شەرفمەندت هەڵبژاردووە، بەلاّم وریای خۆتبە چوونکی هەرزەکار خوێنیان گەرمە لێکدانەوەی بۆ ناکەن، کیـژم نـامووس گرانەنەکەی خۆتی بۆ شل بکەی.!

-ئەوەتۆ باسی چی دەکەی ..تێناگەم.!

-خۆت سەخلەت مەکە کچم، لاو کبێـژان لـە ختـو خۆڕانیـە دەڵـێن..! (چیا بڵندن بێ هەوراز نابن.. کیژ لەماڵە بابان بێ دۆست ویار نابن) پاشان گوتی : تـۆ پێت وایە کە من نازانم ئەوە چەند وەختە شەوان بۆی دەچییە ژووانـێ، وا دەزانـی کە من لە گوێی گادا خەوتووم.!

..لە شـەرمان گشت گیانم شەڵاڵی ئارەقە بوو، حەزم دەکرد ببم بە دلۆپە ئاوێ داچۆڕێمە ژێر زەوی..کە دیتی من زۆر بە سـەرە خۆمدا شکامەوە، دەستی هاوێتە ملم لە خۆی نزیك کردمەوە..بە خۆی وەقرساندم گوتی:

- زینۆ، خۆ من هەڕەشـەم لێنـەکردوی بۆچـی شـڵەژای..؟! گـوتم هـەرزەکارن نەبادا کارێکی نابەجێ و ناهەموارتان لێ ڕووبدات،ئەگەر نـا..؟کوڕەکـە کـوڕێکی چاکە پڕ بەدڵ خۆشم دەوێ بە ئومێدی خوا بە مراز دەگەن،دەبیە کەیبانوی ماڵ.

.. پڕم دا دەستی، دەستی دایکم ماچ کردو گوتم

-دەخیلت بم دایەگیان دەسـتم داوێنت لێم ببورە.!

- قەیدی ناکا کچم خۆشەویستی خەوش نیە، بەلاّم خۆ دۆڕاندن کارەسـاتێکی گەورەو لە بن نەهاتووە.

.. ئای زینۆگیان دڵی دایك چەند گەورەو فراوان و بـە میهـرو سـۆزە،بە هـیچ جۆرێك چاکەی دایك بە ئێمە نادرێتـەوە، دایـك پـیرۆزە..زینۆخـان..نـازانم دایکـم بۆچی ئەوها زوو سەری نایـەوە.؟!هـەروەکو خـەون ڕوخـساری دێتـەوەپێش چـاوم، دایکم ئافرەتێك بوو نەکورت نەدرێژ، بەژن و بالاّی مام ناوەندی بوو، ئەسمـەرێکی ڕەشتاڵەی خوێن شیرن بوو، دووبسکی درێژی هەبوو لێی بـوو بە نـەخش، ئـەبرۆی ڕەشی قەترانی چەشنی قەیتان وابوو، دووچاوی مەیلەو خوماری کافر بۆی لە دین

وەردەگەڕا، ئێستاش سەدای پێکەنینی لە گوێمدا دەنگ دەداتەوە، ئای کە پێکەنینێکی ئەفسوناوی بوو، وا لە پێش چاومە ئەو کاتەی کە بە دیار(لانك)ەوە دادەنیشت بە دەنگێکی نەرم و ناسك بەلایە لایە دەیلاواندمەوە ..!!

لایە لایە ڕۆڵە لای لایە
کۆرپەی شیرنم بۆچ خەوت نایە
دەبنو ڕۆڵە دڵ لە دڵ مەدە
بووکت بۆ دێنم لە شاری نەغەدە..)

..ئیدی بە دەستەخۆم نەبوو فرمێسك بە سەر ڕوومەتم دا خلۆر بۆوە ڕێچکەی بەست گریان لە قوڕقوڕاگەم دا عاسی بوو نتقم گیرا.. زینۆ هەستیار بوو زوو پێی حەسیا، بە نا و لەپی فرمێسکی لە دەموچاو،و لە سەر ڕوومەتم سڕیەوە،پاشان هەردوو چاوی نوقاند بە ئەسپایی دەمی بۆ دەمم هێنا مژینی لەب و لێو.و ماچ و تەڕایەتی ناو دەمی هێندە بەتام و لەزەت بوو دەتگوت: شانە هەنگوینی زۆزانە، هەرچەندی دەمژی.! لێی تێر نەدەبووم کەوتبوومە باری نەستی ئاگام لە خۆم نەمابوو، گەرم داهاتبووم،باشبوو.! زینۆ خۆی لە دەستم ڕاپسکاند گوتی: لێوم تەقی بەسە. ژیان پڕە لە خۆشی. بەڵام هیچ خۆشیەك لە خۆشی ساتەکانی جێ ژووان بە تام و لەزەت و چێژدارو خۆشتر نیە، هەموو خۆشیەك لە بیر دەکرێ، خۆشی جێی ژووان هەتا ئەو ڕۆژەی کە بەخاکت دەسپێرن هەرگیز لە یاد ناکرێ چونکە لە گەڵ خوێن تێکەڵ دەبێ، بە نێو شادەماری مرۆدا دێت و دەچێ، وزە بە هەست و جەستەی مرۆڤ دەبەخشێ.

# بەشی شازدە

شەوی دواتر دوای نوێژی شێوان هەستام ڕۆیشتم لە خاڵ هەباس و بووك بە ژووریَ کەوتم..لە ڕاستیدا لە خۆم تەریق بومەوە ئەوەندەی ئەم پیرەژن و پیرەمێردە بە خێرهاتنم بکەن ..بووك مریەم.نەخێر واچاکە بڵێم (نەنەمریەم).. نەنەمریەم چای ئامادە بوو، خاڵە هەباس کیسەی تووتن و دەفتەرو دار جگەرەی لە پێش خۆی دانابوو،بەدەم چای خواردنەوە جگەرەیەکی لێ پێچاوە، پاشان دار جگەرەکەی بە دەستەوە گرت دوو، سێ جار فووی تێکرد، دواتر جگەرەکەی تێناخنی و نایە دەمی. پاشان چەند جار لە سەر یەکدی لێکدا لێکدا ئەستێ و بەر دەستێ ی لێکدا، تاکو ئاگری گرت،ئەوجا بە هێواشی فووی لە ئاگرە کرد هەتا ئاگرەکە بە جوانی گەشبۆوە، ڤێجا جگەرەکەی داگیرساند.. ئەم چەند چرکەی کە خاڵە هەباس خەریکی پێچانەوەی جگەرە بوو.! من چاوێکم بە ژوورەکەیاندا خشاند.

ناوماڵێکی ڕێکوپێك، خاوێن و جوانیان هەبوو، دوورەفکەی داری ڕەنگاو ڕەنگ لە قەدی دیوار کوترا بوون، هوردەواڵەی جوان و نایابی لە سەر ڕیزکرابوون، دوولا دیواری هۆدەکەیان بە قەزمە نووشتەو پەڕۆی سپی داپۆشرا بوون، بە ناوریشمی ڕەنگاو ڕەنگ بەوێنەی ئینجانەی گوڵ و کەو، کەڵەکێوی شاخدار نەخشێنرا بوون. لە هەمووجوانترو سەنج ڕاکێشتر وێنەی دوو کۆتر بوو لە سەر لیس دندوکیان لەنێو دندوکی یەکدی نابوو. لە دڵی خۆمدا گوتم (لە ختو خۆڕا پێیان نەگوتوە بووك مریەم.! خۆشەویستی گیانی بە گیانی نەیهێشتووەئەم دوو مرۆڤە لە ژیان بێزار بن. لە کاتێکا من نغرۆی خەیاڵبووم.! دەبێ ڕۆژێ لە ڕۆژان من و زینۆش ئەوها پیر بین و بە بەختەوەریی بژین..؟!)

لەم خەیاڵانەدا بووم. وابزانم خاڵ هەباس بە ئەنقەست کۆخی هشیاری کردمەوە گوتی:

- کاکە حەمە. ئاوها جاروبار وەرە سەردانمان بکە. ئێمەش پێ دڵخۆش دەبین و تۆش تەنیای. تەنیای ناخۆشە پیاو وەڕس دەکات. وانییە.؟!

-بەڵێ وایە. بێگومان ناخۆشە.

-باشە کاکە حەمە، ئەوەی بزانم تۆ کوڕێکی چەڵەنگ و لێهاتووی، وێناچێ دەمچەفت بی. بەلاّم نازانم بۆچی هەوڵنادەی کەیبانووەك پەیدا بکەی بۆ خۆت..؟! وا چاکە پیاو نێلێ کۆزی ساوا بێ.

- لالۆ، خۆ بە زۆرە ملێ نییە، هەتا خودا قەڵەمی لێ نەدات، چیبکەم.؟!

پێکەنی گوتی:

ئەگەر من لە کاتی خۆی بە کەرو کاروانی، نەچووبام بۆ مەملەکەتی بیتوێن. خوداش بووك مریەمی بۆم نەدەنارد. دەبوایە هەنووکەش بەبێ..(نەنەمریەم قسەی پێ بڕی گوتی:

خەنجەری لە کالاّن دەرکێشا. بەلاّم باسی درۆ زلەکانی خۆی ناکات. لالۆ پێکەنی گووتی:

ئەگەر درۆ.. ئەگەر ڕاست..؟! من دەستە گوڵی خۆم لێداو هێنام.دەتێکە دوو دیشلەمەمان بۆ تێکە.!

- لالۆ، دەزانی هاتووم داوای یارمەتی و هاوکاریتان لێ دەکەم.!

هەردووکیان گوتیان:

- کارێك بە ئێمە پێك بێ بە سەر چاو.

- بەڵێ لالۆ، ئەگەر تۆو نەنەمریەم پێی هەڵسن..؟ دڵنیام جێ بە جێ دەبێ.

- دەباشە. مادامەکێ دڵنیای بێژە بزانین چییە.؟!

- حەز دەکەم چووبان بۆ ماڵی باوکی(زینۆخان) ئەگەر بەلاتانەوە پەسند بێ، ئێوە لە جیاتی دایکو باوکم داوای دەستی زینۆم بۆ بکەن.!

-تۆ کوڕی ئێمەی، باوکی زینۆش پیاوێکی ئاقڵمەندو دنیا دیدەیە لەم بڕوایەش داین نائومێدمان ناکات، بەلاّم دەمێنێتەوە لە سەر کچەکە خۆی،

نەنەمریەم هەڵیدایێ گوتی:

زینۆ کچێکی گران و سەنگین و ڕەوشت بەرزە، هەتا ئێستێ نەمدیوەو نەمزانیوە پێی بەخواری دابنێ، زۆر بەڕێزیشە،

پاشان گووتی:

- کوڕم، لێگەڕێ با من بەتەنیا زینۆی بدوێنم بزانم تامی زاری چییە..؟ ئەگەر ئەو پێ سەر گران نەبێ.! دایکو باوکی هاسانن. باشە کوڕم.؟!

- بەڵێ نەنە. هەرچی تۆ دەیفەرمووی، من منەت بارم . پاشان هەستامەوە گوتم:

داوای لێبووردن دەکەم چونکی ئەم شەو لە خەوم کردن.

- نا کوڕم بە هاتنت دڵخۆشبووین. ئینشەڵلاّ خودا دڵت خۆش دەکات.

: پاشان ماڵئاوییم لێیانکرد.

# بەشی حەڤدە

بــە قــسەی زینۆخــان بــەیانی ڕۆژی ئاینــدە نەنەمریــەم زینۆخــانی دیتبــوو دواندبووی.!

- کیژم. ئەگەر پێ سەرگران نەبی حەزدەکەم لەگەڵت بدوێم.!

- ئەییە ڕۆ نەنە، چمە جوێنیشم پێ بدەی من نەك قسە، پێ گەورە دەبم.

- کچم زینۆ. سوننەتی ژیان ئەوهایە .! ماڵە باب هەتا سەر بۆ کەس نابێ، کچی عازەب ڕۆژەك زووتر بە ڕووسپیاتی بە ڕێی خۆیدا بڕواچاترە، بۆیە دەڵێم کوڕێکی ناسیاوی خۆمان هەیە، گەنجێکی قۆزو گران و ڕەوشت بەرزە، حەزدەکات بێتە خوازبێنیت، بە مەرجێك ..؟! خۆت ڕات لێ بێ، پێی سەر گران نەبی.

- نەنـە قەیـدی چییە، خـۆ مـن دەزانم کـچ هـەردەبێ شـوو بکـات. بـەڵام هەرکەسێك لەولا ڕاهات و سەلام و عەلێك، نەدیتەوە نەناس، تۆ بڵێ، ئایا ڕاستە شووی پێ بکەم.؟!

- نەخێر ڕاست نییە، چونکی خێزانداری زەحمەتە، بۆ ڕۆژێك و دووڕۆژ نییـە، مافی خۆتە کوڕە بناسی، بەڵام ئەو

کوڕەی بەتەمایە بێتە داخوازیت غەریب نییە دەیناسی؟! کاکە حەمە لاوێکی ڕێك و پێك و ڕەوشت بەرزە.

- بەڵێ دەیناسم، بە ڕواڵەت پێ ناچێ کوڕێکی خراپ بێ، ئەگەر دایك و بابم ڕەزاندمەندیان لەسەر بێت.؟ من پێ سەرگران نیم.

- باشە کچم. بە پشتیوانی خودا قسەی لێدەکەین. ئێوارەی پاشتر نەنەمریـەم و لالۆ هەباس، چووبوون بۆ ماڵی باوکی زینۆ.. ئەوەش هەر زینۆ لە ناو نانـدینێ بۆی گێڕامەوە گوتی: دوێنی شەوی ڕابردوو دوای نوێژی شێوان دیتم نەنەمریـەم و خاڵ هـەباس بـە دارە دارە لێمـان بـەژووریێ کـەوتن، بـابم بـەرزە پـێ لـە پێشیان

هەستاوە زۆر بە گەرمی چووە پێشوازییان. دەستی خاڵە هەباسی گرت لە جێی خۆی دانا. دایکم و نەنەمریەمیش بە هەمان شێوە بە ڕووخۆشی. بابم جگەرەیەکی داگیرساند دایە دەستی خاڵە هەباس، ئیدی بەدەم چای خواردنەوە و قسەو باسی دنیا، بابم پێی گوت:

- دوو قسەی خۆشمان بۆ بکە لالۆ.!

- نەخێر، شتی وا لە ئارادا نییە، هەر هێواریەکی هاتبم بۆ لاتان گەلێك قسەی خۆشم بۆتان کردووە، دڵتان پێ خۆشبووە، تێر پێکەنیوون. ئەگەر وانییە، بڵێ وانییە،؟! بەڵام ئەم هێوارەیە دەگەڵ بووك مریەم بە تەمای ئەوە هاتووین بە قسەو گفتی خۆش دڵمان خۆش بکەن. دەی بزانم وەکو من ئاسای بۆت دەکرێ دڵمان خۆش کەی بە پێکەنینمان بێنن.؟!

- ئەوەی ڕاست بێ لالۆ؟! ئاوەڵلا. قەت وەکو تۆم بۆ ناکرێ هەیپای لێبکەم بڕۆم بۆ مەملەکەتی بیتوێن و کەتنەکی وەکو ئەوەی تۆ کردت هەرگیز لە دەستم نایەت. نەنەمریەم هەڵیدایێ گوتی:

(بەسەری تۆ قەسەم ئەم هەباسە دەم چەفت و ترسنۆك و قەلە زراوی وەك خۆی نییە و نابێ، بەڵام لە ڕاست درۆی زل و زەبەلاح شایەدی بۆ دەدەم، بەلێ کەس نیە شان لە شانی بدات، وەستای قسان و کۆلەواری دەستانە، خۆت دەزانی

هەرزەکار لێکدانەوەی بۆ ناکات، ئەو سا جحێڵ بووم تازە هەڵدەچووم، جحێڵ کوێرە، نابینایە، ئەویش بە زمانی لوس لە خشتەی بردم. بە کورتیەکەی خودا بۆی هێنابوو، ئەقڵم بڕی کرد لەگەڵی هاتم. ئێستاش بە درۆیەکانی دڵم دەگوشرێ، ئەگەر نا.! پێ سەر گران نیم خۆشم دەوێ) پاشان لالۆ بە پێکەنینەوە لێی وەگرتەوە گوتی: ئەم قسانەی تۆ پارە و پوول ناکات، ئەو کەس مەردە بەری خۆی لە ئاوێدا بیەڕێنێتەوە.ئەگەر نا هیچ. هەر هەموومان لە تریقەی پێکەنینمکان دا. دواتر لالۆ بە باوکمی گوت :

- دەزانی بە ئیش هاتووین.!

-هەرئێوەوئیش لالۆ، فەرموون ئەوە ماڵ وا لەپێشتانە،هەرچی ئێوە دەخوازن دەستی لەسەردادەنێن.! حەلاڵی ئێوەیە.

- خودا بەرەکەتی بهاوێتێ، پێویستیمان بە ماڵ و شتو مەك نییە، وەلێ ئەوەی ڕاستی بێ. من دۆستێکی بە ڕێزو خۆشەویستم هەیە، زۆرم خۆشدەوێ، کوڕێکی ڕەوشت بەرزو هێمن و هۆشمەندە. جابۆیە هاتووین داوای دەستی زینۆخانی بۆ بکەین. چونکە هەموو گەنجێك هی ئەوە نییە سەر بە بالیفی زینۆ بکات، ئەم کوڕە شایانی ئەوەیە سەر بە سەرینی زینۆ بکات.!

- بەڵێ لالۆ . من دڵنیام ئەگەر ئەو دۆستەی جەنابت کوڕێکی ڕەوشت بەرزو شەرەفمەند نەبێ. ؟! تۆ نایەی داوای دەستی زینۆ بکەی بەلام شتێك هەیە با پێشوەخت پێت بڵێم.! ئەو برادەرەی تۆ هەرچەندە خانەدان و ماقوڵ بێت، ئەگەر زینۆ ڕەزامەندی لە سەرنەبێت. ؟!مـن هەرگیز زۆری لێناکەم،چونکە زینۆ لە بڕیاردان سەربەستە زۆری لێناکەم

- بەڵێ قوربان. من نالێم خەنجەری بە ڕووتی لە سەر ملی دانێ .! ئیللا و بیللا شووی پێدەکەی، نەخێر بەلام زینۆ کچێکی ژیرو هۆشمەندو کارامەیە، ئەگەر کوڕەکەی بە دڵ نەبوو. ؟! هیچ. نەنە مریەم خۆی تێهەڵقورتاند گوتی:

جا ئەم مشتو مڕەی بۆ چییە. ؟! هی بن بەڕێ بلا بێت سەر بەڕێ ڕووی کردە باوکم پێی گوت:

- تۆ بە خۆت لە هەموومان چاتری دەناسی.! کاکە حەمەی برادەری خۆت پێویست ناکات ماندوومان بکەی.!

- بەڵێ دەیناسم نەنە. زۆر چاك دەیناسم و کوڕێکی ژیرو ڕەوشت بەرزە و ئەگەر زینۆ پێ سەرگران نەبێ. ؟!

لەلایەن منەوە پێشکەشە. نەنەمریەم باگۆی داوە گوتی:

- پێویست ناکات بە دووری بخەینەوە. ئەوە گوێی لێمانە،کچم زینۆ. !لە ڕوودا مەمینێ، مافی خۆتە بێ شەرم وەلام بدەوە. ئا.. یا ننا؟! دایکم لێی وەرگرتەوە گوتی:

- کچم، زینۆ قسەکانی باوکت گلەیی و گازاندەی لێناکرێ، بڕیاری چارەنووسی خۆت بە خۆت بدە. نەك پاشە ڕۆژ سەر کۆنەمان بکەی.!

زینۆ گوتی: لە خۆشیان و لە شەرمان گشت گیانم شەلالی ئارەقە بوو، نازانم

کوو بەسەر زمانم و زارم دا هات گوتم.!

(دایە. مادام نەنەمریەم و خالّە هەباس و باوکم دەڵێن: کوڕەکە کوڕێکی چاك و شەرەفمەندەو سبەی ڕۆژێ دەتوانیّ ژیان و گوزەرانم بۆ دابین بکات .! مـن لـەوە زیاتر هیچم ناویّ.)

بەقسەی زینۆی. باوکی گوتبووی.!(لالۆ هەباس ئـەوە هـیچ هونـەرو پیـاوەتی منی تێدا نییە، چونکی زینۆ خۆی لە بڕیاردان سەر پشك بوو) پاشـان لالـۆ ڕووی کردبووە نەنە مریەم پێی گوتبوو.! بووك مریەم نەمگوت بە دڵ ساردی

نامان نێرنەوە. ها.! پاشان گوتی: دڵی ئێمەتان خۆش کرد، خودا دڵتان خۆش بکات دیسان چامان خواردەوە، پاشان هەستان ڕۆیشتنەوە). من لە هێوارێـوە لـە سەر ئاوو ئاگر بووم. دیق و سیقم کرد، حەجمانم نـەبوو کـەی دێنـەوە، مژدەیـەکی خۆش ناخۆش، دڵم هەزار ڕێـی دەکـرد داخـوا بۆچـی دواکـەوتن.؟! لـەم شـێنەوەو بێنەیەدا بووم گوێم لە دەنگی نەنەمریەم بوو گوتی (چاوت لە بەر پێی خـۆت بـیّ هـەباس نـەبادا سـاتمە بکـەی) ئـەم پیرەژنـە و پیرەمێـردە هـەر بـەم شـەوە هـاتن پیرۆزباییان لێکردم نەنە مریەم هەردوو دەستی بۆ ئاسمان هەڵبڕی.!

(ئیشەللاّه، نۆبەرەتان نێر دەبیّ . بە دایك و باب گەورە دەبیّ) ئیـدی زمـانم تێکئالاّ نەمزانی کوو سوپاسگوزاریان بکەم. گوتم:

کەرەمکەن دانیشن.! لالۆ گوتی: نەخێر کەی زینۆمـان گواسـتەوە ئەوسـادێین دادەنیشین چای دەخۆینەوە، بەلاّم بە مەرجێك.؟! لێمـان لالـوت نـەبن. گـوتم مـن بەش بە حاڵی خۆم لالووت نابم، بەلاّم سەبارەت بە زینۆ نازانم.

گوتی: کچیّ بووك مریەم خۆ گوێت لێی بوو.؟! هێشتا هیچ لـە گۆڕێـدا نییـە دەپاڕێتەوە؟!

-کورە دەبڕۆ بابڕۆینەوە درەنگە. کەی وەختی ئەم فشقیاتانەیە. ڕۆیشتن.

# بەشی هەژدە

ئیدی هێدی هێدی تاقم و تەدارەکی بووك تەواو بوو، دواتر ڕۆژێکیان سەر لە سبیانێ ڕۆژی هەینی بوو، دانیشتوانی حەسار خۆیان تەیار دابوو، ئافرەتەکان خەریکی چێشت لێنان بوون، پوورە ئامینەی دایکی ئاسیا سەرپشتی لێ بەستابوو سەرپەرشتی دەکردن، لە ناوەڕاستی حەوشەی حەسارێ فیقەی زورنای (سەید کەریم) ی زورنا ژەن و دەنگ و سەدای دەهۆڵ کوتانی (زەنون)ی دۆلەنگێو ڕۆژە ڕێیەك دەڕۆیی .کوڕە جحێڵ و کچە عازەب دەستیان گرتبوو ڕەشبەڵەك گەرم بوو مەپرسە.

: لە بارەی ڕەشبەڵەك دەگێرنەوە دەڵێن.!

(جارێکیان شایی ڕەشبەڵەك بوو، کیژە ڕەوەندەك تازە فێری شایی دەبوو، زۆری حەز لە شایی بوو، چوو بووە ناوشایی، جحێڵەکان دەزانن تازە فێری شایی بووە، بە ئەنقەست دەستی بەر نادەن، هێندەی هەڵدەپەڕێنن ئارەقە لە هەموو گیانی سەر دەکات. تاوەکو دەمەدەمی نیوەڕۆ، کاتێ کە بۆ نان خواردن دەڕۆن دەست بەردەدەن دواتر کچە دەڵێ.!(ئۆی خودێ ڕەشبەڵەك هێندە خۆشە بۆیە (تە) پێناخۆشە). کاتێ سەر قاڵی شایی و هەڵپەرکێ بووین دیتم ئاسیا پەیدا بوو، ئاسیا چ ئاسیا! هێندە جوان خۆی ڕازاندبووەوە هەر حەزت دەکرد تەماشای بکەی. دەتگوت.! پەری یە تازە لە ئاسمان دابەزیوە، یەکسەر چووە ناو کۆڕی شایی، بێنەکی خۆش شایی کرد.پاشان بۆ ئەوەی شاییەکە گەرم و گوڕ بکات.! تەماشا ی دەکرد کامە لاو ئافرەتی لە دەست نییە دەچووە دەستی، ناوە ناو بە دوای کچە شەرمنەکان دا چاوی دەگێڕا.!دەستی دەگرتن دەیهێنان بۆ ناو شایی . شاییەك بوونەسەری دیاربوو نەبنی..(هەتا ئەو ڕۆژەی سەر دەنێمەوە

دەمرم.چاکەی خەڵکی مرۆڤدۆست و خێرخوازی دانیشتوانی حەساریّ هەرگیز بە من نادرێتەوە، باسی ئاسیا هەرناکەم،ئەگەر ئەو رۆژە، رۆژی زەماوەند حەوت خوشکم هەبوایە هەرحەوتیان لەناو کۆڕی شایی دابان، هەرگیز وەکو ئاسیای پاکیزەیان بۆ نەدەکرا، ئاسیا بۆ من چەشنی فریشتە وابوو). دوای بانگی نوێژی عەسر، ئوتومبێل ئامادەکرابوو، بووکیان سوار کرد بەرێکەوتن، چەند ئوتومبێلەکی دیکەش بە فیقوو هۆڕ دوا بە دوای قەمەرەی بووك ڕێچکەیان بەست بە شەقامەکانی شاردا گێرایان. (ئەوسا داب و نەریتی بووك گواستنەوە بە م چەشنە و دەستوور وابوو.!! کە بووك دەگەیە جیّ دەبووایە زاوا سەرکەوێتە سەر بانیژە، یان سەرکەوێتە بان سەر دەرەی دەرگەی حەوشە. دوو.سیّ چنگ شیرنی دەگەڵ خۆی دەبرد، کە بووکیان دادەبەزاند دوو ئافرەت لەملاو لە ولای بن پیلیان دەگرت هێدی هێدی بە چەپڵە رێزان و (بووکانە بووکانە) و سەماکردن دەهاتن تادەگەیینە ئاستی زاوا.. ئەوجا زاوا چوکلێتەکانی بە سەر سەری بووك دا دەکرد ..(شیرنی لە کوردەواری دا پێیانووایە. کە بووك و زاوا لەلای یەکدی شیرن دەبن) بن باڵیان گرتبوو. هێواش هێواش هێنایان، چاوم لێبوو ئاسیا بەسەر ئاماژەی پێدام.! حاڵیبوم دەستەسرێك پڕ لە شەکرۆکە بوو بە سەرسەری بووك دا تێم هەڵدا. شەکرۆکە بە گوڕیّ وەربوو. ئیدی منداڵ تێرووهاتن کردیانە رۆژی حەشر..

(دەزانی هیچ رۆژەکی ژیان لە رۆژانی منداڵی خۆشترو بیّ خەمتر نییە) ئیدی دەهۆڵ دڕا تەقەی بڕا . کەهێوارە داهات چۆڵیانکرد، لالۆ هەباس گوتی: کوڕم حەمە، فەرموو برۆ بۆ لای زینۆخان ئێستا لە چاوەڕوانیدایە.! شەرم دایگرتبووم، نتقم گیرا بوو، زۆر زگم بە خۆم سووتاوە، بیرم لەوەدەکردەوە.!لەم رۆژەخۆشەدا نەدایك، نە باوك، نەبرا، نەخوشك، کەسێکی خۆت لە دیارت نەبیّ، لە جێوە بە عاردی وەنووسابووم.. دیسان لالۆ پێی گووتم: هەستە کوڕم دەی شەرمی ناویّ.! هەستامەوە بە ئەسپایی خشیم، خەریك بوو برۆمە ژووریّ بۆلای زینۆ. ئاسیا دەرگەی کردەوە لای زینۆ بوو دەهاتە دەریّ، بڕوات. دوای پیرۆزبایی لیّ کردن گوتی:

(حەق نەبوو بێم. چونکی لێتان نەگێڕابوومەوە، بەلاّم هەرچەندی کردم خۆم پێ نەگیرا، چونکی هەردووکتانم خۆش دەوێ بۆیە هاتم.. پاشان ڕووی وەرگێرا ناوڕی داوە پەنجەی بۆ زینۆ درێژ کرد گوتی: ئەم ماکەرەت دیوە. ئێستاش بڕواناکات کە چەندم خۆش دەوێ، پاشان پێی گوتم: حەمەگیان.ئاگات لە خۆت بێ.ئەم مەکرۆی مەکربازە بە مەکران نەت خەوێنێ، دواتر بە پێکەنینەوە بە زینۆی گوت: کچێ تیتك براى ئەوە پێت دەڵێم.! نەکەی دلّی کاکە حەمە بشکێنی، هەر بزانم خۆت گران کردووە وات لە حالّی)

چاوم لێبوو زینۆیە هەڕەشەو گوڕەشەکانی ئاسیا پێکەنین گرتبووی. بۆیە بە لەپی دەستی توند دەمی خۆی گرتبوو.

پاشان ئاسیا ڕۆیشتە دەرەوە دەرگای بە دوای خۆیدا پێوەداوە. دواتر وەکو مێوان ئاسای سلاّوم لە زینۆ کرد.زینۆ وەکو خانەخێ لە بەرم هەستاوە سەرپێ بە شەرمەوە وەرامی دامەوە. هەر بۆ ئەوەی شەرمی بووکێنی بشکێ.! نێوچەوانیم ماچ کرد، بە خێرهاتنیم لێکرد. دواتر چووم دانیشتم. زینۆخان هێشتا هەر ڕاوەستابوو. دەستیم گرت بە هێواشی لە تەنیشتەخۆم دامنا،دیار بوو شەرمی بووکێنی هێشتا بەرچاوی گرتبوو چاوی بلّند نەدەکرد.

لەوە پێش کاتێ شەوان دەچوومە جێ ژووانێ لەناونانەدین، زینۆ لە هامێزە خۆی دەگرتم وەکو ساوا دەیلاواندمەوە . بەلاّم ئەم شەو شەوی بووکێنی.توند.توند زینۆخانم لە هامێزی خۆم گرت هێدی هێدی بە قسەی خۆش و پێکەنین هێورم کردەوە. شەرمی بوکێنیم لە سەر چاوی وەلانا وەکو لاو لاو ئاوێزانی یەکدی بووین. گۆتەکی کوردی هەیە دەلّێ (ژنە بدە بە ژن مردی.کەر بدە بە کەر تۆپی). منیش وەکو کابرای ژن مردوو ئاسای لە خۆشیان پێم عاردی نەدەگرت . من نەمدەزانی ژیانی خێزانداری هێندە خۆش و بە تام و لەزەتە و چێژە. پێشان کە بەیانیان لە خەو هەلّدەستام. شلو خاو بە لەقەلەق دەچووم بۆ چایخانە پارووە نانێکم بە پیالّە چایەك دەکردە قاوەلّتی.ژەمی نیوەڕۆم لە قاوەلّتی بەیانیان چاتر نەبوو، بۆ ژەمی هێوارانیش مشتەری شۆربا فرۆشەکەی سەرشەقام بووم، بەلاّم شۆربا چ شۆربا ؟! ئەوەی (دان) بوو تێدانەبوو، ئاوێکی ڕووت و پەتی تام ساردی

لێوە دەهات و هیچی تر.. وەلێ لەو ڕۆژەی کە زینۆخان ببووە کەیبانووی ماڵ.! لە بن بۆتکەوە ژیانم گۆڕا، بەیانییان کە لە خەو هەڵدەستام زینۆ نانی گەرمی چێکردبوو. چای دێم کردبوو، پێخۆر.! هەرچی خوداوەند بە قسمەتی کردباین قاوەڵتیمان پێدەکرد. نیوەڕۆیان دەچوومەوە سەر حازرەکی. هێواران مەقەرەی ڕەژوو گەش کرابۆوە. چراکەی داگیرساندبوو، کە خۆم تەنها دەکرد مەسینەو دەست شۆری دەخستە بەر دەستم. ئاوی بە دەستمدا دەکرد، دواتر لە لەگەنێکی دووکەسی پڕاوپڕ لە چێشتی گەرم هەڵمی لێ هەڵدەستا، دووقۆڵی شانەوشان دادەنیشتین هەتا تێرمان دەخوارد، دواتر هەریەکەو دووچای

شیرنمان لە سەردەکرد، پاشان زینۆ هەڵدەستاوە قاپ و مەنجەڵو دەفرەکانی دەشۆری و ئاوتوی دەکردن، دواتر سەرو پەرچەم و هندامی خۆی ڕێکدەخستەوە دەهات ڕانی بەرانمەوە دەنوساند،ناوە ناوە چایەکی دیشلەمەی بۆم تێدەکرد، وەکو کوێخای (دۆم)ان، بێ خەم و خەیاڵ زۆر بە ئاسودەیی دیشلەمم فڕدەکرد. نیدی شەو دەبووە دەریایەکی هێمن و ئارام، ئێمەش دەبووین بە دوو ماسی ڕووت لە قوڵایی دەریادا بە ئاسانی لەنگەرمان دەگرت. ئاوێزانی یەکدی دەبووین، نازانم.! لە چ کاتێکدا خەومان لێدەکەوت.

# بەشی نۆزدەم

مرۆ هەتا ئەو ڕۆژەی وەغر دەکات، بێگومان لە ژێر یەك کراس ناژی. منیش لە بازاڕی سەوزە فرۆشان دوکانەکم بەکرێ گرت، سەوزەو مێوەجاتم تێدا دەفرۆشت، باوکی زینۆ دانی عەسران لە کاتی دەست بە تالّی دەهاتە لام لە دوکان دادەنیشت، کە دەهات خەڵك دەهاتنە میوانداری و هامشۆیان دەکرد،زۆر بە نەرمی و بە شێنەیی دەدوان هەروەکو دەڵێن: (لە بێ خەبەران کەشکەك سەڵەوات). من لە گوێی گادا خەوتبوم.بەڕێزیان تێکەڵ بە سیاسەت ببوو. سیایەت باز بوو، بەڵام بە بێزارتان نەکەم ئەم هەویرە ئاوی زۆر هەڵدەگری،دواتر(ئەو) ناوە ناو پیاوە نهێنیی یەکانی پێم دەناساندو ڕۆژێکیان کابرایەکی سوالکەری پێم ناساند، ئەقڵم بڕی نەدەکرد ئەم سوالکەرە لە توانای دابێت کاری حزبی جێ بە جێ بکات.

گوتی:ئەم بەڕێزە لێپرسراوی دابەشکردنی ئەدەبیاتی حزبە لە ناو شار.پاش ماوەیەك بە فەرمانی حزب کابرای دەرۆزەکەر ڕەوانەی شارێکی دیکە کرا.. دواتر لە شوێنی (ئەو) پیرەژنێکی بۆرو چڵکن بلاوکراوەو ئەدەبیاتی دەگەیاندە دوکانەکەم.لە ڕاستی دا دوکانەکەم ببووە(وێستگەی حزب) بۆ من خراپ نەبوو.بە دوو سەر قازانجم بوو، یەکەم هەر لە جێوە لە ناو دوکان ئەرکی حزبایەتیم بە جێ دەگەیاند، سە رباریش بازاڕم بە هەڕمێن کەوتبوو، دەستکەوتم باشبوو.. سبەینەکێ کەچوومە دوکان لەبازاڕی سەوزەفرۆشان دیتم.!چەند پۆلیسێك فڵچەو بۆیاغیان لە دەست دا بوو قەدی ئەو دیوارانەی کە لە شەودا نوسرابوون بە بۆیاغ نوسینەکانیان ڕەش دەکردەوە تێیان دەچۆلاند، مشتەریەکم هەبوو کابرایەکی پۆشتە بوو، جلوبەرگی ئەفەندیانەی دەپۆشی، دیاربوو تێر بوو لووت بەرزولەخۆ

ڕازی بوو، پاشان زانیم بە ڕەچەڵەك دەرەبەگ بوو.بە ئەنقەست لێم پرسی:

- ئەریٚ ئەفەندی. ئەوە چبووە چی ڕوویداوە.؟!

بە فیزو لووت بەرزیەوە گوتی:

- ئەوە چەند کەسانێکی زەغەڵ و تەمبەڵ هەن، ناتوانن بە کارو کاسبی نان بۆ خۆیان پەیدا بکەن. لاکەیان دیٚ لە برسان. کەچی فێربوونە شەوان لە قەدی دیواران قسەی قۆڕو بیٚ مانا دەنوسن.

- باشە .ئەفەندی. ئەو نووسینانە زەرەری بۆ کێیە.؟!

-ئەدی کوو زەرەری نییە.؟! جوێن بە حکومەت دەدەن..

-ئەوانە کۆمەڵێك گەمژەو گەلحۆ دەستی یەکیان گرتووە داوای تەخت و تاج دەکەن).دواتر بە بۆڵەبۆڵ ڕۆیی.

من دەمزانی ئەفەندی کێندەری دێشیٚ . کە پرتەو بۆڵەی ئەفەندیم لە گەڵ قسەکانی بابی زینۆ لێکدی نزیك دەکردەوە! وەکو ئەوە وابوو ساردو گەرم لێك بخشێنی. بلاچەی ئاگری لیٚ هەڵدەستا. بێگومان ئەم بلاچەیە ڕۆژیٚ لە ڕۆژان دەبێتە بڵیسەو گڕدەگریٚ تەڕو هیشکە پێکەوە دەسوتێنیٚ. زینۆخان. لە سەر مانگ و ڕۆژی خۆی بوو، سیٚ بەتری شەو ڕاشکابوو زینۆ ژانی هاتیٚ حەجمانی نەبوو، نەدەکەوتە ناوجیٚ، دەیزروکاند، زۆر شپرەزە بوو گوتی:

(برۆ بە شوێن دایکم بابیٚ. بە هەشتاوی ڕۆیشتم مامۆژنم ئامادە بوو هات، چووە ژوریٚ بۆ لای زینۆ، هەندەی وێنەچوو. بە توندی گەڕاوە ڕۆیی، لەو سەر کە هاتەوە پوورە ئامینی دایکی ئاسیا ی لە گەڵ بوو. بە هەڵداوان چوونە ژوورەوە بە دوای خۆیاندا دەرگایان پێوەدا. شمشێرەیان ڕەپێش کرد، من لە پێش دەرگا بە تەنیا مامەوە، هەر ئەوەندەم لە دەست هات لە خودای پەروەدگار بپاڕێمەوە.!

(خودای گەورەو میهرەبان هاوار. زینۆخان سەلامەت بیٚ، بە سەلامەتی ڕزگاری بیٚ، هیچی دیکەم ناویٚ) وەکو

گو ناحبار دەپاڕامەوە.. هەرچەند جاری گوێم لە زروکەوقیژەی زینۆ دەبوو،ڕۆحم دەهاتە کونە کەپووم. دواجار لە هیکەوە دەنگی گریانی (مەلوتکە)یەکا هاتە بەر گوێم، لە خۆشیان وەختبوو بەندی جگەرم بپسیٚ..

سوپاسی یەزدانم کرد.دوو فرمێسکە بەختەوەری بە سەر ڕوومەتم دا خلۆر بوونەوە. دوای چەند چرکەیەك پوورە نامینە بە ناستەم دەرگای وەلانا، لە بەر ڕۆشنایی قەندیلۆکە دیتم.! زینۆ ڕاکشا بوو چاوی هاوێتبووە سەر یەکدی..دواتر پوورە نامینە گوتی:

- کورم حەمە. خودا کوڕێکی جوانی پێتان بەخشیوە، بەلاّم لە بیرنەکەی مزگێنیم دەویّ ها.!

- بەلّیّ پووریّ، هەرتۆو مزگێنی. بەسەرچاو.

حەزم دەکرد بچم نێوچەوانی زینۆ ماچ بکەم و کۆرپەشمان لە هامێزە خۆم بگرم، بەلاّم داب و نەریت ڕێگر بوون لە حەزو ئارەزووم. ئیدی سێ شەوان مامۆژنم و پوورە نامینە بە نۆبەت دەخەوتن، ئێو بەتیان لە کۆرپەلّەکەمان دەگرت، نەبادا.! (شەوە) دەستی بگاتێ هەلّپیشێری بیکوژی.. دوای سێ شەو ئێشکگرتن، دوای بانگدان بە گوێی کۆرپەمان، دە(١٠) سەلّەواتمان لە دیداری خۆشەویستی خودا لێدا، پاشان لە سەر قسەی باپیرەی ناومان لێنا! هیوا.

# بەشی بیست

ئیدی ساڵ هات و ساڵ بوری، هیوا، گەورە بوو چووە بەر خوێندن. یەکەم ساڵی بوو پێی نابووە قۆناغی ئامادەیی وهێوارەکیان پەرتووکەکانی لە پێشە خۆی دانابوو، هەرگێرو وەرگێری دەکردن، نازانم چۆن بوو لێم پرسی

-کاکە هیوا، بەخێر کە خوێندنت تەواو کرد، بەنیازی ببی بەچی.؟!

-بەڵێ بابە، حەزم لێیە ببم بە ئەفسەر.

زۆر بەلامەوە سەیر بوو، دەبێ بۆچی ئەم پیشەیەی هەڵبژاردبێ .؟! هەرچی من بووم حەزم لێبوو ببێتە پارێزەر .!

بۆ ئەوەی ڕۆژێ لە ڕۆژان لە هۆڵی دادگا بەرگری لە بەشخوراو هەژارو چەوساوان بکات.. ئەو.بە پەرتووکەکانیەوە خەریك بوو، من بێ چاوتروکاندن سێرەی نیگام لێگرتبوو، واهاتە پێش چاووم.!!

پێموابووکە (هیوا) لە هۆڵی گەورەی دادگایی کردن سەڵتەی پارێزەری پۆشی بوو، هۆڵی دادگا لە بەر قەرەباڵغی دەرزیت هەڵدا با بە عاردی نەدەکەوت، سەرۆکی دادگا و دەستەی دادوەران لە شوێنی تایبەت دانیشتبوون چاوەڕێ بوون، لەناکاو سەرۆکی دادگا کوتکە بچکۆلانەکەی بە دەستەوە گرت، سێ،چوارجار لە مێزەکەی بەردەمی خۆی دا، دەنگی لێدانی کوتکە چکۆلانەکە لە ناو هۆڵەکەدا دەنگی داوە، ئامادە بووان هشیار بوونەوە بێدەنگ بوون. پاشان سەرۆکی دادگا فەرمانی دا.! تۆمەتبار بێننە ژوورێ. لە بەراییدا دوو پۆلیسی چەکدار هاتنە ژوورێ لە شوێنی دیاریکراو تایبەت چەقین، دواتر پۆلیسێك تۆمەتباری وەپێشەخۆی دابوو،هەردوو دەستی لە کەلەپچە دابوو، بەلاّم بەر لەوەی بیکاتە ناو قەفەزی تۆمەتباری، بەفەرمانی سەرۆکی دادگا کەلەبچەیان لە مەچەکی دا داکەلاّند.. کابرای تۆمەت بار دەتگوت ! ئاژەڵە کێوی یە تازە ڕاو کراوە، بەزۆری

زۆردارەكی خستبوویانە ناو قەفەز.ڕەنگی ڕوو، و ڕوخساری تێكچوو بوو، نێو چەوانی لۆچی كردبوو. دیار بوو خەم وقارو خەفەتی زەمانە تێلكەو مەسوسانێی خۆی پێكردبوو كووڕی كردبووەوە، لەگەڵ ئەوەشدا چاوی نەدەتروكاند و چاوی بە حەشیمەتی ئاپۆرای ئامادە بووان دەگێڕا، وەكو بڵێی: بە تاسوقەوە چاوی بۆ كەسێك دەگێڕا ..دواتر بینایی لە بلاچەی دا.! چاوی ڕۆشن بووەوە، چاوم لێبوو زەردە خەنێكی باریك بەسەر قەیتانی هەردوو لێوی داهات دەستی بلندكرد بۆیان گرژییەوە.!

ئافرەتێكی ڕوخسار فریشتەی و پێنج،شەش منداڵی سەركەو بنكەی بێناز، منداڵەكان شاگەشكە ببوون دەستیان بۆ باوكیان بەرزدەكردەوە،بەلاّم هەرچی دایكەكەیان بوو جێی پێ جێنەبوو خۆی گرمۆڵە كردبوو لە حەیبەتان خیزی ناو دەمی خۆی قوت دەداوە.

سەرۆكی دادگا دیسان بە كوتكە چكۆلانەكەی قوروقەپی بەخەلكەكە كرد،بێدەنگبوون سەرتاپای جەستەیان لە ئاست هەیبەتی ئەو كوتكە چكۆڵەیە ببووە(گوێ) گوێڕایەڵبوون.

:گەلۆ.! ئەگەر مرۆ بۆ دەستنوێژگرتن چوو بۆ سەر ئاو كوتكێكی بە دەستەوە بێ بۆ سەری قرژاڵەكان خراپ نییە) كە خەلكەكە هەست و خوستیان بڕا.

سەرۆكی دادگا ڕووی دەموپرسیاری ئاراستەی تۆمەتبار كرد لێی پرسی:-

- ناوت چییە،؟!

-قەلەندەر.

-تەمەنت.؟!

-چل و پێنج.

-لەكوێ دادەنیشی.؟!

-دانیشتوی ئەم شارەم،لە گەڕەكی جولەكەكان،لە كۆنە تەویلەی ولاّخی بەرزە لەمەرِ عوسمانلی، لە سەر زێدی باب و باپیران كرێچیم.

-لە ماڵەوە چەند سەر خێزانن.؟!

..خۆم و دایكی ئەو منداڵانە، لەگەڵ دوو كارەكەرو سێ خزمەتكاری

جەنابت .

..باشە چکارەی.؟!

-من بە تۆمەتی دزی دەستگیرکراوم، واتا دزم.

-سەرۆکی دادگا بە مەیلەو پێکەنینەوە.!

-وادیارە پیشەی دزی لە بابەلبابەوە بۆت ماوەتەوە.ها.؟

:تۆمەتبار لە قاقای پێکەنینی دا، تێر پێکەنی، لەبەر پێکەنین لە بیری چوو وەلآمی پرسیارەکە بداتەوە، سەرۆکی دادگا بەم پێکەنینەی تۆمەتبار زۆر پەست و تورە بوو، تێی ڕاخوری.!

-ئێرە نەچایخانەیە،نەدیوەخانە تاکو بەماشای خۆت لە قاقای پێکەنین بدەی، پێمان بڵێ بزانین بەچی پێدەکەنی.؟!

-داوای لێبوردن دەکەم بەڕێز..چونکی پێکەنینەکەم بەدەست خۆم نەبوو،ئەسڵەن بەوە پێکەنیم.! دەڵێن:

(گەورە ئاو دەڕژێنی، گچکە پێ لێدەخشێنێ). ئێمەش لێڕاهاتوین چاو لە مەزن و گەورەکانی خۆمان دەکەین.

-مەبەستت چی بوو لەم قسەیە تێناگەم.؟

-هەر ئەوە بوو گوتم.

سەرۆکی دادگا لە گەڵ دەستەی دادوەران لە نێوان خۆیاندا فسکە فسکیان بوو، دواتر پارێزەری دادخواز داوای لە سەرۆکی دادگا کرد ڕێگای پێبدات بە ڕوونکردنەوەی چەند زانیاریەك لە سەر کەسی تۆمەتبار..هەر لە جێوە هەستاوە سەر پێ ڕووی کردە دەستەی دادوەران گوتی:

لە دانیشتنەکانی ڕابردوو بۆمان دەرکەوت کە (تۆمەتبار) بە دوو سەرە تۆمەتبارە. یەکەم بەکاری دزی. دووەم بە کوشتنی مرۆڤەکی بێ چەك، لێرەدا بەپێی یاسا هەرکەسێك ببێتە هۆکاری کوشتنی کەسێکی بێ چەك بە تایبەتی.! دەبێ ئەو کەسە بکوژرێتەوە.. بۆیە داوا لە سەرۆکی دادگاو دەستەی دادوەرانی دادگایی کردن دەکەم بەوەی کە دەبێ تاوانبار لە جیاتی خوا لێخۆشبوو بکوژرێتەوە.!

:حەشیمەتی ئاپۆڕای نـاو هـۆڵی دادگـا تێکـڕا دەسـتیان پـێ کـرد.! ٠ دەبـێ بکوژرێتەوە.. دەبێ بکوژرێتەوە..).

سـەرۆکی دادگا دیسان بە هۆی کوتکە چکۆلانکەی خەلکەکەی هێورکردەوە.. پاشان هیوا. پارێزەری بەرگری لە تۆمەتبار، ئیزنی لـە سـەرۆکی دادگـا خواسـت، هەستاوە سەر پێ چوو ڕووی پرسیاری ئاراستەی تۆمەتبارکرد .!

-ئایا تۆ لەوە پێش دەتزانی بەوەی کە دزی کـارێکی خراپـە و تاوانکـاری بـە دوادا دێت.؟

-بەڵێ دەمزانی.

-باشە دەتزانی بۆچی دزی دەکەی .؟!

-بێکارم، برسیمان بوو، ئەگەر دزیم نەکرد بایە.؟!

مندڵەکانم دەمردن لە برسان. بۆیە ناچارم.

-باشە بۆچی هەولێت نەدا کارێك بۆ خۆت پەیدا بکەی..؟! یان لە یـەکێك لـە دامو دەزگاکانی میریی بەمووچە خۆر دابمەزرێی.؟!

-بەڵێ بەرێز..هەولم دا، هیچ دەرگایەك نەما لەم شـارە سـەری پێـدا نەکـەم. بەلام بێ هوودە بوو.

-باشە. ئەو شەوەی کەبۆ دزی چوویتە مالی خودا لێخۆشبوو بۆمان بگێـڕەوە چۆن بوو، چی ڕوویدا.؟!

-بەڵێ بەرێز، بروات بێ ئەوەی ناوی زادە.! لە مالەکەمانـدا نـەبوو، برسـێتی شالاوی بۆمان هێنابوو ترسام، زۆر ترسام مندالەکانم بە زیندوویەتی چاوان لە بەر چاوم دا بمرن..

:ئاماژەی بـۆ لای منداڵـەکانی ئاراسـتەکرد گـوتی: درەنگـی شـەو بـوو خـۆم هاوێتە حەوشەی مالی خودا لێخۆشبوو، دەرگەی ژووری دانەوێلەم لە ڕیسمە بـرد چوومە ژووریێ، چاوم گێڕا تاریك بوو، دەستم کووتی.! نیسك بێ/ نۆك بێ/ سـاوار بێ/ برووش بێ/ هەرچی بێ هەرخواردەمەنی بێت وبەس لە بـەرد نـەرمتربێ،وابی بخوریێ، مندالەکانم

پێ لە مردن ڕزگاریان بـێ.لەودەمـەی کـەمن لـەژووری دانەوێلـە بـووم.تـەقا

خاوەن ماڵ لێم بە ناگا هات دەنگی دام.! نەبزوی کورە سەگباب.هەرئەوەندەم بۆ کرا دەستم بە چاوم وەنا بۆی دەرچووم،بەڵام تاوەکو من بە سەر قاندرمەدا سەر کەوتم بازمدا کۆڵان. ڕەحمەتی دەرگای حەوشەی کردبۆوە دەرپەڕی بۆوە دەرەوە.. ئیدی لە هەللای دا.!

حەس حەس لێم بەناگا هاتن،(ئەها دزە بیگرن..ڕاوەستە کوڕە ئەڕۆی سەگباب.من تێم تەقاند بۆی دەرچووم لەم کۆڵان بۆ ئەو کۆڵان،حەسحەس لە دواوە تەقەیان لێکردم .گوللەیەك بەر قاچم کەوت.هەتا برینەکەم گەرم بوو خۆم نەدا دەست،بەڵام کە برینەکەم ساردبووەوە پەکم کەوت، حەسحەس گەیشتنە سەرم دەستگیر یان کردم.

-باشە پێمان بڵێ بزانین، ئایا تۆ چەکداربووی.؟! لەگەڵ جۆری ئەو چەکەی کە بەدەستتەوە بوو.؟!

-نەخێر .من چەکدار نەبووم،ئەگەر چەکدار بوومایە.! بێگومان هەربۆ ترساندن چەند گوللەیەکی بووکانەم بەسەر سەری حەسحەسەکاندا حەواڵە دەکرد.

-باشە. ئەی ڕەحمەتی چۆن کوژرا.؟!

-من کەبازمدا کۆڵان نەمزانی ڕوو بە ڕووی حەسحەس ڕامدەکرد. ئەوانم دیت،زانیم لێیان دەرباز نابم،چەورەم کردەوە بە غاردان ڕووبەڕووی ڕەحمەتی گەڕامەوە.وابوو حەسحەسەکان لە دواوە دەست ڕێژیان لێم کرد.گوللەیەك چزەی لە قاچمەوە هێنا. ڕەحمەتیش وەبەر دەست ڕێژی حەسحەسەکان کەوت کوشتیان.

پاشان هیوا، ڕووی لە سەرۆکی دادگا کرد گوتی:

سوپاس بۆ بەڕێزتان ئەگەر بفەرموون ماوەم پێبدەن هەندێك سەرنج و تێبینی بخەمە ڕوو.! فەرمووچت هەیە بیڵێ. بەڕێز سەرۆکی دادگا،بێگومان پرسیارو وەڵامەکانتان بیست، شاراوە نیە کە تۆمەتبار ناچاربووە پەنا وەبەر دزی ببات، دزی بکات، لە پێناو ئەوەی چەند مرۆڤێك لە مردن ڕزگار بکات، مردنیش چۆن مردنێ .؟!لە برسان. بێگومان

هەر کەسێك لە ئێمە ئەگەر جگەر گۆشەکەی لە برسانا ڕووبە ڕووی مردن بێتەوە..؟!دڵنیام لەوەی کە کاری خراپتر لە دزی ئەنجام دەدات نەك دزینی ژەمێك

دانەوێڵە . چونکی لە برسان خوێن بەرچاوی دەگرێ، کەی راستە هاولاتیەك کاتێ داوای(کار) لە کۆمەڵ و لە حکومەت دەکات هەموو دەرگاکان بە ڕوویدا دابخرێن.؟! مانگێك/دوو/سێ بێکارو بێ دەرامەت، ئاخر ئەم داماوە ئەرکی دابینکردنی بژێوی حەوت سەرخێزانی لە ئەستۆی دایە، ئێوە بفەرموون بەچی و چۆن بیانژێنی.؟! تکا دارم لە بەڕێزتان بە چاوی سۆزو خۆشەویستی تەماشای خاوخێزانی تۆمەتبار بکەن، بۆچی لە پای چی.؟! بمرن لە برسان.هیچ یاسایەك نییە بڕیاری کوشتنی بەسەردا بسەپێنێ، بێگومان بەشی هەرە زۆری گوناحەکە دەکەوێتە ئەستۆی کاربەدەستانی پیاوانی میری. چونکی پێویستە لە سەر کاربەدەستانی حکومەت لە پێناو بنەبڕکردنی دیاردەی دزی و جەردەیی و ڕێگری: برەو بە پیشەسازی نیشتمانی بدەن، کارگەو فابریقەی نوێ دابمەزرێنن، پێداچوو گوتی: داوا لە بەڕێزان سەرۆکی دادگاو ئەندامانی دەستەی بالآی دادگایی کردن دەکەم، بەوەی بڕیاری بەرائەت و ئازادکردنی تۆمەتبار بدەن، هەروەها گەلآڵە کردنی بڕیارێك سەبارەت بە حەقە خوێنی کەسی کوژراو، کە لە خەزێنە دەوڵەت بژمێردرێ،وەك حەقەخوێن بدرێ بە کەسوکاری ڕەحمەتی.ئیدی بوو بەچەپڵە ڕێزان. هاواریان کرد.!! (ئازادی.. ئازادی. ئازادی..)

هێشتا هەر بە خەیاڵ لە هۆڵی دادگا بووم. زینۆخان چایەکی دیشلەمەی خستە بەردەمم. هشیاربوومەوە. تێرامام هیوا هێشتانەکێ هەر خەریکی خوێندنەوە بوو.

## بەشی بیست و یەك

مرۆ تاکو تێکەڵ سیاسەت نەبێ نازانێ چجۆرە کرمێکە تێکەڵ بە هەست و هۆش و شادەماری بیرکردنەوەی دەبێت.وەکو دەردە (پیسەکە)وایە،هەتا ئەو ڕۆژەی دەتکوژێ پێوەی دەتلێتەوە..وڵاتی ئێمەی کورد،زۆر دەوڵەمەندە، سەرخان و ژێرخانی هەمووی سامان و گەنجینەی بە هادارە،هەر ئەوەشە بوویتە جێ چاوی تەماحی حکومەتی پاشایەتی/حکومەتی کۆماری/حکومەتی قەومی و حکومەتی شۆفینی دیکتاتۆریەتی بەعس، هەر هەموویان بە مەبەستی پاکتاوکردنی نەژادی و گۆڕینی سیمای نەتەوەیی میللەتی کورد، بەئاگرو ئاسن درێخیان نەکردووەو هەرگیز نایکەن.هێشتا زەمەن، زەمەنی حوکمی کۆماری بوو، بڵێسەی ئاگری شۆڕش لە دۆندی چیا سەرکەشەکانەوە ئاوێتەی بلاچەی بابە گوڕگوڕ بوو..لاوی کورد هەروەکو ئەوەی بڵێی .! بۆ سەر ئاهەنگی زەماوەندی بووك گواستنەوە داوەت کراوە.هەر بابا بوو بەچەك و تفاقی خۆی بەرەو پیری ڕۆشنایی بڵێسەی شۆڕش دەچوو،ئەو ڕۆژەی (عبدالسلام عارف) لە ئاسمان لەناو فڕۆکەدا سۆتا.من لە بەری پشدەر لە گوندی(شێخ ئاودەلان) لە بەتالیۆنی چواری لەشکری هێزی کاوە دا پێشمەرگە بووم، ڕۆژێکیان دەمەدەمی بانگی عەسر، من وهاوڕێیەکی پێشمەرگە لەدەرەوەی گوندی لە نۆبەتی ئێشك دا بووین. چاوەدێری ڕێگاو باغان دەکرد، دیتمان..!لە خوارەوە (٣) کەس بەرێوە بوون دەهاتن. خۆمان لێیان دانوساند لێیان بێدەنگبووین. تاکە هاتنە بەر لولەی تفەنگ، دوو سەربازو هاوڵاتی یەك بوون، لە هیکەوە دەنگمان دان..!

-لە جێوە نەبزوون، دەستتان بڵند کەن.

هاوڵاتییەکە هاتە دەنگ گوتی:

- خۆمانین ئارام بن.

ئیدی لێیان دەرپەڕین پێشمان لێگرتن . سەربازەکان ڕەنگی ڕوویان پەڕی بوو لە ترسان. وەکو زەردەچوو زەرد هەڵگەڕابوون.تۆقیبوون نتەیان بەردابوو، هاوڵاتی یەکە مێرد منداڵێکی سیانزە،چواردە ساڵان بوو تفەنگێکی کردبووە شانی،تفەنگێکیشی بەدەستەوە بوو لە سەرپێ بوو،پەنجەی لەسەر پەلە پیتکەبوو،تەواو ئامادە باشبوو،لێمان پرسی :

-پێمان بڵێ بزانین مەسەلە چییە. ؟!

-ئەم دوو سەربازەم چەککردووە،دیلن.

-چۆن چەکت کردن. ؟!

-من شوانی بزنە گەلم. هۆلەو ئاقارەی خوارەوە بزنەکانم دەلەوەڕاند. ئەم دوو سەربازە لە شاری ڕادەچوونەوە بۆ

(ڕەبایە). هۆیەم قووتە ملانەی پشتی (قەلاّدزێ)وەن، بەلای خۆرهەلاّت.کەمنیان دی لایاندا هاتن دانیشتن، چەکەکانیان لە تەنیشتە خۆیان درێژ کرد.بێ ترس بوون.هیچ حسابێکیان بۆ من نەکردبوو،بۆیە زۆر بێ شەرمانەو

بێ ئەزاکەت دەستیان کردە قسەی قۆڕو هیچو پوچ ئەگەر لە پێش دەمی پشیلەت ڕووکردبایە دەمی بۆ نەدەبرد بیلێسیتەوە، بۆیە لە حەیبەتان چاوم چووبووە پشتی سەرم،ئاماژەی بۆ یەکێکیان کرد. ! گوتی:

ئەمەیان هەر لە جێوە لەسەر گازەرەی پشت ڕاکشا. هەردوو دەستی هاوێتە بن سەری، هەر دەیرێست و ئەیدەبرییەوە، بەلاّم ئەمەیان هەستاوە سەر پێ چوار، هەنگاو لێمان بەدوورکەوتەوە، دوگمەی پانتۆڵی ترازاند وەکو ڕەشەوڵاخ ئاسای هەر بە پێوە پەلە میزی هەڵدا دەمیزت. ئەوەندە لێیان دەهری ببووم ئاگوترێ، چونکی دەڕشانەوە.ئیمانم دەکەللەی سەرم دا نەمابوو،تفەنگەکانیان لەو گوڕە کەوتبوون،بەرزە پێ لەجێوە قیتبوومەوە سەرپێ.وەکو هەڵۆ ئاسای چۆن

.؟!دەنیشێە سەر نێچیرو چنگی لێدەدا قیرە بری دەکات، ئەوها لە تفەنگەکان ڕووهاتم. تفەنگێکم بە دەستەوە گرت. سەرە سمکێم گەیاندە تفەنگەکەی دیکەو بە دوورم خستەوەو پاشان تفەنگم سوار کردو تێم ڕاخوڕین .!

-ئەبزوون ها. ئەگینا ساردتان دەکەمەوە، هەردووکیان سامگرتی بوون. دواتر

به زمانی خۆیان ما لیّم بپاڕێنەوە.!

-یەمعەوەد.کاکە ئەمە برای تو، ئەمە شەقە دەکەی لە گەل تو.فەرق نییە، کوردو عەرەب برا.

دووبارەبە سەریاند نەڕاندم .!

-یەلڵلا پیّشم کەون، ئەگەر نا.! داتان دە بێژم.دیسان ناورانەوە!کاکە، خاتر نەللاّ.! ئەمە جوندی فەقیر، حکومەت ئەمە ئیعدام دەکەی، ئەمە هەیە ئەتفال کوچکە، زغەییر. گوناح.

به هەر حالّی هەبوو تێمگەیاندن، ورتە لە دەمتانەوە دەرنەچێ، هەر پەل بزێیویەکی بکەن دەتانکوژم .. ناچار بوون سەریان بەرداوەو بە پێشە خۆم دان بەلا ڕێدا هاتین، بەرێوە جاروبار پێی خۆیان گران دەکرد، لە بەرفێل دا بوون، لوولەی تفەنگم دەخێواندە برپرەی پشتیان، ناچار پێیان هەلّدەگرت،بەسووکی ڕێیان دەکرد، ئیدی بەم شێوەیە تا هێنامن بۆ ئێرە). پاشان بۆ ماوەی دوو هەفتە پتر سەربازەکان لای ئێمە لە بارەگای بەتالیۆن مانەوە. لە گەلّ ئێمە دەیانخواردو دەیانخواردەوە. وابوو هێوارەکیان دوای نوێژی خەوتن بە فەرمانی سەرکردایەتی شۆڕش . دوو پێشمەرگەیان بە گەلّدان. هەتا نزیك ڕەبیەکانی خۆیان بە ڕێیان کردبوون، پێیان گوتبوون.! (ئێوە بە فەرمانی سەرکردایەتی شۆڕش ئازادن، فەرموون برۆن، بەلاّم ئەوەی دیتتان و بیستتان بۆ گەورەکانتان بگێڕنەوە). ئەم مێرد منداڵە، ئەم دوو (سەمینۆف)ەی کە لە سەربازەکانی ستاندبوو،یەکێکی کردە شانی، ئەوەی دیکەی دا بە جبەخانەی شۆڕش، ئەم کوڕە ژیکەڵەیە لە ڕیزی لەشکری پێشمەرگەی کوردستاندا ماوە. ناوی (سەرمەند) بوو، بەلاّم پێشمەرگەکان بە (بچکۆل) بانگیان دەکرد..بەلاّم بچکۆلّ چ بچکۆلّ .؟!

کورتە بالاّیەکی پرچ قژن. هێندە بزێو ئازاو چاپوك و توند تۆلّ و گورج و گۆل! بوو. دەتگوت . پەلیکە، پێشمەرگەکان خۆشیان دەویست.ئەوەندە دەو دەوانێیان لە گەلّ کردبوو داریان لە دەمی وەردابوو. مەپرسە. چەند جەربەزە و جاقی ببوو.جا ئەگەرشەوان بۆ کەمین و بەسەرردادانی ڕەبایەی جاش و سەربازی نەچووباین. دوای نوێژی شێوان دەبووە زۆرانبازی و ململانێ و بەزم و

ڕەزم..پێشمەرگەیەکی ئازاو بە جەرگ و دلێرمان لەگەڵ دابوو ناوی (قادر) بوو. بەڵام بە (قالە بەراز) مەشهور بوو، زەلامێکی کەڵەگەتی چوارشانەی مل قەوی بوو، دەتگوت: فیلە تەنە، فیلانی هەڵکەوتبوو.بەڵام خەسڵەتی، سووخەتی بەراز بوو، کاتێ کە دەچووین بۆ سەر ڕەبیەی عەسکەری، یان پەلاماری ئۆردووگایەکی سەربازیمان دەدا. هەتا شەڕ گەرم دەبوو.!قالە بەراز،هەموو گیانی وەکو دار بی ناو ڕووبار دەلەرزی. حەجمانی نەبوو. دەتگوت: بەفری لێباریوە.. دواتر لەگەڵ گەرمبوونی شەڕ و دەنگی تەقەو هاشە هاشی

هاوەن هێدی هێدی گەرم دادەهات ترسەکەی دەشکا، هاکا دەتدیت هەڵدەستاوە سەر پێ . جەمەدانییەکەی لە ملەخۆی دەئالاند. قۆنداخەی ڕەشاش برێنەکەی بەشانییەوە دەقرساند، هەتا دەنگی تێدابوو هاواری دەکرد.!

(یان کوردستان یان نەمان). پاشان ملی پێوەدەنا دوژمنی دادەگرت، دەیڕشاند . نێر نەبوو لەبەر سەدای نەعرەتەی قالە بەراز خۆی ڕابگرێ، لە هەر قۆلەکی قالەبەرازی لێبووایە دوژمن فشیدەکردەوە. کلکی خۆیان دەقنگی خۆیان دەناوە پشتیان دەدا. لەزۆرانبازی و ململانێشدا هیچ کامێکیان باری قالە بەرازیان نەدەبرد، هەموو جارێ دەیگوت: (دوو،دوو بۆم وەرن). کەس خۆی لە گورە نەدەبرد، لە ڕاستی دا کەس لە خۆی ڕانەدەدیت بچێتە مەیدانی زۆرانبازی ئەو فیلەتەنە،ئەویش هەڵدەستاوە سەرپێ دەینەڕاند..ئێوارەیەکیان.بچکۆل لەجێوە نانشکی دابوو نیوە ڕاستبووەو گوتی:

-ئەوە چ فشە فشتە کاکە قادر.!

ئەگەر لە خۆت ڕادەبینی. فەرموو من بە تەنیا بۆت دادەبەزم، بەڵام بە مەرجێك.؟!

قالە بەراز پێکەنی گوتی:

-خۆ گوێتان لێبوو..؟! بە مەرجیش نەبێ زۆرانبازی ناکات..ئەم بەزمە خۆشە.دەبێژە بزانم پێش مەرجت چییە پاڵەوان.؟!

-کاکە قادر. بەشاهێدی ئەو شاهێدانە ئەگەر تۆ توانیت پشتم لە عاردی بدەی ..؟! ئەوەلە سەرمە بەم شەوە بڕۆم بۆ ناو ڕەزەکانی خوارەوەی دامێنی

ئاوایی. یەك دەستە قەرتاڵە ترێ و هەنجیر بێنم بۆ شەو چەرە، بەڵام ئەگەر خودا کردی من پشتی تۆم بە عاردی دادا.! لە سەرتە بڕۆی ترێ و هەنجیر بێنی، دەڵیی چی،؟!

ئیدی بچکۆڵ و قالەبەراز لێك ڕاست هاتن تێکگیران، ماوەیەك یەکدیان هێناوبرد، بچکۆڵ لەنکاوڕا لە هەردوو جووتە گونی قالە ڕووهات توونـد گرتی، ئەوەندەی قالە بەراز بەمشتەکۆڵە لە سەرو گوێلاکی دا. نەخێر بەری نەدا. توونـد گرتبووی بەرزە فتی کردبوو. هەرچی ئێمەش بووین لەبەر پێکەنین کەوتبوینە سەر پشت، بچکۆڵ بە مەش نەوەستا، پێیەکی دا بەرپێی قالەبەرازشلپەی لێوەهات کەوتەخوارەوە بە عاردی دادا،پێی گوت: ئەوها ترێ و هەنجیرت پێ دەینم . ئیدی بەریدا.. قالە بەراز خەریکبوو دای بپەلۆسی نەمانهێشت ئازاری بدات. دواتر هەرچۆنی بوو قالەمان هێور کردەوە، پاشان قالە بەراز لە تریقەی پێکەنینی دا گوتی: دۆڕام.دواتر بەم شەوە قالە بەرازو پێشمەرگەیەکی دیکە پێکەوە ڕۆیشتن. یەك دەستە قەرتاڵە ترێ و هەنجیرو سێویان هێنا.

بچکۆڵ شان بەشانی من دانیشتبوو، ترێ و هەنجیرمان دەخوارد. سەیر لەوە دا بوو.! ئەم قوڕمساخە بچکۆڵ، دەمنادەم دەیگوت(بخۆن کاکە بخۆن، لە حسابی کاکە قالەیە نۆشی گیانتان بی گۆشتی پێبگرن). قالە سەری خۆی بادەداو دەیگوت: (تۆ سەیری کە، بزانە ئەم بەرەڵلایە لە کوێوە بۆ من پەیدا بوو. ئەگەر دەیتولخێنمەوە.؟! ناوێرم. دەبێ لە (خەلان) پاڵدەمەوە. دیسان بەبەریدا کەوتین ساردمان کردەوە. دوای شەو چەرە لە بچکۆڵم پرسی:

-بچکۆڵ پێمان بڵێ چۆن بە خەیاڵت دا هات ئەم فێڵەی لێبکەی.؟! پێکەنی گوتی:

(ماڵمان لە گوندەکی بوو گوندەکە بەردەبازی خێڵەسات بوو بۆ کوێستان وگەرمیان. کێخوای گوندی سەگێکی زەبەلاحی هەبوو ناوی سەگەبازی بوو، ئەوە کاپێلکی کەللەی سەری بوو. سەگە بازی زنجیرکرابوو. هەردەم تێروتەسەل بوو. چاوی سۆرببوو، کێخوا فێرە شەڕەسەگی کردبوو، هەرخێڵەکییەك، هەر ڕەوەندێك، هەر شوانکارەیەك ڕێی بەبەردەباز کەوتبایە.!خۆشیبا ترشیبا دەبوایە شەڕەسەگی

کردبایه بە مەرجێك.؟! تاکو یەکیان ئەوەی دیکە دەخنکێنێ نەدەبوو لێکیان بکەنەوە. سەگەبازی ئەوەندەی سەگ خنکاندبوو لە خوێن ڕشتن ڕاهاتبوو کە چاوی بە سەگێکی هاو ڕەگەزی خۆی دەکەوت هەڵدەستاوە سەر پاشی . دەیویست هەرچی زووە پەلاماری بدات تێکوپێکی بشکێنێ خەڵتانی خوێنی بکات .

ڕۆژێکیان کۆچ و کۆچباری خێڵی (دۆم) مان هاتن،دەڕۆیشتنەوە بۆ کوێستانەکانی ئەو دیو. کێخوا ڕێی لێگرتن، گوتی(ئەگەر شەڕە سەگ نەکەن. هەرگیز ناهێڵم بەبەردەبازدا ڕەتبن.)

کێخوای دۆمان بەناچاری داخوازی کێخوای بەردەبازی قبولکرد..پاشان چوو سەگێکی پوسەلەی گوێ قووتی پەتك کردبوو هێنای..سەگەبازی کە چاوی بەسەگە پوسەڵە کەوت بۆی هەستابووەوە سەرپاشیان دیڕاند، ئیدی زنجیریان لە ملی سەگەبازی داکەلاند تێکیان بەردان، ئامبازی یەکدی بوون یەکدیان دا بەر قەمپاڵان، سەگەبازی بە چەپەڵۆکان سەگە پوسەی خستە ژێر دەست و پێی خۆی دەمی نایە قرقرتۆکی بە تەمابوو بیخنکێنێ، بەلاّم هەرچی سەگە پوسەلە بوو لە ژێرەوە دەمی بۆ هەوراز کردەوە قەپاڵی لە جووتە گونی سەگەبازی دا توند گرتی و ڕایتەکاند و بایدا.. سەگە بازی کەوتە لوورە نوورو قڕوسکاوە، کێخوای دۆمان خەریك بوو بچێ لێکیان بکاتەوە، بەلاّم کێخوای بەردەباز ڕازی نەبوو، گوتی:

(لێی .گەڕێ ئەوەی دەمی بنێتە خوێنی هاو ڕەگەزی خۆی. اچارەنووسی لە چارەنووسی سەگەبازی چاتر نابێ). سەگە پوسە گونی سەگەبازی گرتبوو بەرزەفتی کردبوو بەری نەدا هەتاکو تۆپاندی ساردی کردەوە. منیش لە سەگە پوسەلە فێربووم. بەم فێڵە دەستی خۆم دیت). یەکێك لە پێشمەرگەکان گوتی:

(بچکۆڵ.واتا بەقسەی تۆ، قالە سەگەبازییە تۆش سەگە پوسەڵەی، وانییە.؟!

هەر هەموومان تێکڕا لە قاقای پێکەنینمان دا . بەلاّم هەرچی قالە بەراز بوو بەم قسانە دیسان قوشقی بوو، هەڵچووبوو ددانی بە جیڕەوە دەبرد، بەلاّم بەوەی باشبوو زوو هێور دەبووەوە.

(لەم قسانەدابوو. دیار بوو لە دەرونەوە ئاهێکی ساردی هەڵکێشا چاوی پڕ فرمێسك بوو. لێوی بە تەتەڵە کەوت، بێدەنگ بوو قسەی بۆ نەدەکرا، پاشان

گوتی: لێم مەگرە غەریبیم هەڵساوە بیریان دەکەم، نازانم ئەو کوڕە ئازاو بە جەرگانە چیان بە سەرهات.؟! چارنووسیان بەچی گەیی.؟! پێدا چوو گوتی: دنیا،(نادین)ێکە کۆمەڵێك کەمتیاری گەندە خۆرو کۆمەڵێك پشیلەی بەبا، سەرپەرشتی دەکەن. بێگومان هەتا ئەو گەندە خۆرانە کارگێڕی نادین بن هەرگیز ناهێڵن تێر بخۆین پشوو بدەین)

:لەگەڵ ئەم قسانە دیاربوو خەو چاوی گرتبوو، وەنەوزی دەدا خەوەکوتکەی دەبردەوە. پێمگوت: یارۆ بابیکەین بەشەو.

بەشی بیست و دوو:

ڕۆژێکیان سەرەتای وەرزی بەهار بوو، کات دوای نوێژی نیوەڕۆ بوو، گیاو گۆڵ نواڵە و قەد پاڵ و پێدەشتی شاخەکانیان داپۆشی بوو، بەفر لە لوتکەو خۆروەزان بە تیشکی خۆرەتاو دەبریسکاوە، وەلێ ئەم شوێنانەی کەوتبوونە خۆرنەوازان سێبەر باڵی بەسەریاندا کێشا بوو، من لە خۆروەزان پشتم دا بووە دیواری بارەگا سەیری دیمەنی جوان و دڵفڕێنی نیشتمانەکەم دەکرد ها کا دیتم کاکی(تەتەر) پەیدابوو، نامەیەکی قەزمە نووشتی ئاسای دایە دەستم. قەزمە نووشتیم کردەوە.! نامەی (هیوا) بوو.

دوای ڕێزو سڵاو نوسیبووی.!

(باوکە. حەزدەکەم مزگێنیەکی خۆشت بدەمێ. ناوم لە کۆلیژی سەربازی دەرچووە. لەم چەنانە دەچم بۆ بەغدا دەوام دەکەم، بابەگیان. ئەگەر لە یادت مابێ جارێکیان لێمت پرسی ((لە دوا ڕۆژ بە نیازی ببی بەچی.؟! گوتم! ئەفسەر، لەبیرتە ها.؟ بەڵێ باوکە هیواو ئاواتم ئەوەبوو ڕۆژێ لە ڕۆژان ببم بە ئەفسەر، دەزانی بۆ.؟! چونکی پیشەی ئەفسەری پیرۆزو خزمەتێکی گەورەیە، لەناو کۆمەڵگادا ڕێزی لێدەگرن..) هتد.

لە ڕاستی دا سەرم تێچۆلابوو. بۆچی داڵغەی لە پیشەی ئەفسەری داوە.؟! گەنجە لەوانەیە هەر لە بەر ئەوەی بێ . پۆشاکی ئەفسەری بێجگە لە جوانیەکەی. بەسام و هەیبەتە. خەڵکیش لێی دەپەنگنەوە، لەدڵی خۆمدا گوتم: گرنگ نییە لە پاشەڕۆژ پێدەکەوم، لەوەلامی نامەکەیدا لە نامەیەکدا بۆم نووسی.!

(کورِم هیوا .هەر مرۆڤێك ئەگەر حەزبکات لەناو کۆمەڵ دیار بێت و خەڵك ڕێزی لێبگرن، خۆ بە جل و بەرگ و ئەستێرەی سەر شان نییە. بەکردەوەی چاك و ڕەوشتی بەرز ڕێزی لێدەگیرێ. جاخودا دەیکرد ئەو مرۆیە زبلڕێژ دەبوو نەك ئەفسەر.

ڕۆڵە .! تۆ هێشتا نومای لە ژیان حاڵی نەبووی، چونکی نازانی دزو ڕێگرو پیاو کوژیش بەناوو دەنگن لە دنیادا. خەڵکانێك هەن ڕێزیان لێدەگرن.بەلاّم گرێ کۆرەکە لێرەدایە.! چونکی نازانی بۆچی ڕێزیان لێدەگرن.؟ من ناڵێم پیشەی ئەفسەری کارێکی نەیسە، بەلاّم دەبێ ئەوەش بزانی.! بەوەی کە میللەتەکەمان پێویستی بە مامۆستا/پزیشك/ دادوەر/و ئەندازیارو پارێزەر هەیە. بگرە چوار یەکی ئەمانە پێویستی بە ئەفسەر نییە. دەبێ ئەوەش بزانی کە لە کاتی شەڕوپێکداادان بچوکترین پێشمەرگە لە دەست بزێوی ودەست وەگەری ودەست وەشاندن دا خۆی لە ئەفسەرێکی

جەنگاوەری پلە بەرز بەکەمتر نازانێ لەبەرەی شەڕ . ئەوەش بزانە کە ئەم گەنجە ڕەش وڕووت و کورەلاوانەی کە بۆیان نەلواوە بخرێنە بەر خوێندن، یان خوێندن تەواوبکەن، ئێستا وا لە بەرەکانی شەڕدا چەکی شەڕەف و بەرگریان کردووتەشان، سەنگەریان لە دوژمن گرتووە بە خوێن بەرگری لە کەرامەتی گەل و سەروەری نیشتمانەکەیان دەکەن. واتا بە خوێن هەڕەشە لە دوژمنی داگیرکەر دەکەن،بۆیە هەرگیز نابەزن. ئومێدەوارم بە

چاکی بیری لێ بکەوە) ئیدی ساڵ هات و ساڵ ڕۆیی، هیوا کۆلێژی سەربازی تەواو کرد، بەم بۆنەیەوە نامەیەکم لە (هیوا) وە بۆ هات. لە کۆتایی نامەکەیدا نووسیبوی .! (باوکە. حەددم نییە ئامۆژگاریت بکەم، بەلاّم دەڵێم.! ئێوە لەم شاخ و داخەدا وەك ئەوە وایە بە دوای قەڵقەلاشکی بابردوو ڕابکات.بۆیە حەزناکەم لەوە زیاتر تاڵی بکێشی. دڵنیام لە مەبەستم دەگەی).

بەڵێ ئێستاکێ حاڵیبووم جەنابی (ملازم هیوا) فری بەسەر گەل و نیشتمانەکەی دا نییە. دەرسی لە شەیتان وەرگرتووە. مێشکی دەبغ بووە. خودا بکات ڕیشی خۆمان نەگرێتەوە. هەرباشە.

## بەشی بیست و سێ

لە هەموو بەرەکانی جەنگ شەڕ بەردەوام بوو، هەندە وەخت ئاسمان یەکپارچە ئاگرباران بوو، گوللە بە گوللەی دەکەوت،ئەوەی مایەی شادی و بە ختەوەری و خۆشی بوو.! سەرکەوتن لە دەست ئێمەدا بوو.
·جارێکیان لە ڕێوی یەکییان پرسی بوو.ئایا تۆ خۆشبەزی یان سەگ.؟! گوتبوی: سەگ .پێیان گوتبوو ! باشە کەوایە ئەی چۆن ناتگاتێ بتگری. ؟گوتبوی:من بۆ خۆم ڕادەکەم.بەلاّم هەرچی سەگە بۆ نان ڕادەکات.بۆیە هەرگیز نامگاتێ).
لەم ڕوانگەوە بوو بۆیە سەرکەوتن هەر لە دەستی ئێمەدا بوو، کاتێ کەوتینە ناو وەرزی هاوین حکومەت لەشکرێکی گەورەی لە هێزی سەربازی وجاش سەلاحەددین و جاشی خالید پێکهێنابوو بە نیاز بوو بە پانتای بەرەی شەڕ هێرش بکاتە سەر بنکەو بارەگاکانی لەشکری پێشمەرگەی کوردستان. ئەو لەشکرەی کە لە هێزی سەربازی ئامادەکرابوو بۆ هێرش و پەلاماردان،لە لیوای تەکاوەر (مغاویر) بوون. واباو بوو،!! کە ئەو تەکاوەرانە گوللەیان لە تەختی نیوچەوانی بدەی. نەخێر هەرگیز ناگەڕێنەوە، ئەسلەن نازانن گەڕانەوە چییە.؟! لە قسان پەکیان بە برسێتی و تێنوویەتی و هیلاکی ناکەوێ .ئەگەر هیچ نەبوو بیخۆن.! بۆق و مارمیلکە و خەمەگرو. کەروێشك و ڕێوی و سەگ و پشیلە و. هەرچی دەستیان بکەوێ هەر بە کالّی دەیخۆن و برۆ بازۆ. گوایە هەرکاتێ زۆر تێنووبن.! وەکو مانگای بۆگە خۆر، چلّپاو بێ.. میزاو بێ، پیسە خاوێنەگرفت نییە ملی پێوە دەنێن هەتا زگاو دەبن دەیخۆنەوە..نیوڕان لەکەلی کەوتبوو دیار بوو بەرایی لەشکر لە شاری بەدەرکەوتن دەهاتن، کە لە شار بە دوور کەوتنەوە، ئێمە بە

دووربین تەماشامان
دەکرد چاومان لێبوو بەرایی و دوایی لەشکر گەیشتنەوە یەك، بنەو بارگەیان بە عاردی دادا، سەربازەکان خەریکی هەڵدانی خیوەت بوون، بەم ناوەختە نازانم چۆن بوو دیقەتم دابووە قالە بەراز .! هەموو گیانی دەلەرزی، دەتگوت:
کرێوەی لێکەوتوە قەسرییە لە سەرمان. قالە بەراز بە مەبەستی تێچۆلاندنی لەرزینەکەی پرسیاری کرد :
-ئەریٚ کەی دەست پیٚ دەکەین. ؟
-کەی هاوەنەکانی خۆمان لە بلاچەیان دا، ئەوسا دەست پێدەکەین.
- بچکۆڵ گوتی: پێموایە کەوتینە ناو هاوین چونکی ڕۆژەکەی زۆر گەرمە. لە گەرمان حەجمانم نییە، کەچی کە تەماشای کاکە قالە دەکەم.! وادەزانم کوشندەی سەرماو سۆڵەی زستانە،
-باشە لالۆ.تۆ حیسابگری پێمان بڵیٚ بزانین ئاخۆ هاوینە یان زستانە. ؟!
-قالە بەراز لە بنی زمانی گەیی، پێیگوت:
وەڵاهی سەگی سەگباب بتگرم بەم شاخەت دابدەم، دەبیٚ بتکەمە چڵم. هەتیمە دەم و ژەمی لە کن نییە.
:جاوەرە لەگەڵ ئەمانە تێکەو فڕکە، ئێمە لە چ حاڵ داین، ئەوانەش لە بەزم وڕەزمی خۆیان ناکەون،بەبچکۆڵم گوت. !
-کوڕم بچکۆل بسەکنیٚ کاتی فشقیات نییە.
-باشە لالۆ، من چیم گوتووە. ؟ ناوی کەسێکم هێناوە. نەخێر، پرسیاری هاوین و زستانم کرد خۆ کفرم نەکرد،عەریف کەریم گوتی:بەلاٚم فیکەی حەرامزادە دیارە. بچکۆل پێیگوت: ئەریٚ بە ڕاست کاکی عەریف لە مێژ بوو دەمویست پرسیارت لێبکەم. چاکبوو وەبیرم هاتەوە.
-تۆ عەریفی پۆلیس بووی،یان عەریفی عەسکەری بووی. ؟!
-عەسکەری بووم بۆچی دەپرسی. ؟!
-هیچ، هەر حەزمکرد بزانم. دواتر دیسان بەرانگژی قالەبەراز بووەوە پێگوت:
-باوکم دنیا ساردە، دەڵیی چی بڕۆم پاڵتۆیەکت بۆ بێنم بەلکو گەرم

دەبیەوە.؟!

- قالە ئەوەندەی لێ تووڕەببوو. لە حەژمەتان بوو پێکەنی گوتی:

-کوڕی باش ئەگەر ڕاست دەکەی لە خەمی منداڵی.! بڕۆ دایکتم بۆ بێنە، بەڵکو گەرمم بکاتەوە.؟

بچکۆل هەرگیز خۆی لە گورە نەبرد، گوتی:

-باشە بەچاوان.قەیدی چییە،. بەڵام تۆ لەپێشدا بڕۆ خۆت ناوە گڵێ بکە.!

- ئیدی خۆمان پێنەگیرا، هەموومان لە قاقای پێکەنینمان دا. نازانم کێ بوو.؟! یەکێك لە پێشمەرگەکانی گوتی(بۆچمە قالە سەگە خۆی ناوە گڵاو بکات)؟!

لەم بەزم و ڕەزمەدابووین، کاتێك هاوەنەکانی خۆمان لە بلاچەیاندا، هاششەیان دەهات بەسەرسەری ئێمەدا ڕەت دەبوون، لە ناوەڕاستی مۆلگەی عەسکەری بە عاردی دەکەوتن، دەبووە تۆزو دوکەڵ و گەردەلوول، چاومان لێبوو سەربازەکان تێکدەقژان،عەریف کەریم سێرەی قازیفەی ناڕاستەی ئوتومبێلەکانیان کردبوو. دەیگوت: بچکۆل تەماشاکە.! یەك، یەك ئوتومبێلەکانی تێکەشکاند. بچکۆل وەکو منداڵ ناسای هەڵدەپەڕی و دادەبەزی. هێندە بە جوانی و لێهاتووی هەڵدەپەڕی و دادەبەزی. چەپڵەی لێدەدا، دەتگوت! هونەرمەندێکی مەزنە لە سەر شانۆ سەمای

سەرکەوتن نمایش دەکات. شەڕ گەرم بوو، چاوم لێبوو قالە بەراز جەمەدانییەکەی لە ملە خۆی ئالاند، ڕەشاش برێنەکەی خستە سەرپێ، پاشان ناوڕێکی لە بچکۆل داوە، زۆر بە وردی سەرەنجی لێگرتبوو، دواتر بانگی بچکۆڵی کرد. بچکۆڵ چوولە پێش دەمی قیت ڕاوەستا گوتی: بەڵ کاکە فورمەوو.! قالە بەراز، دەستی خستە بان سەری پێیگوت (بچکۆل گیان داوای لێبوردن دەکەم، پەشیمانم ناماقولیم کرد قسەم بە دایکت گوت..بڕوا بکە بە قەد کوڕی خۆم خۆشم دەوێی ئەو کوڕەی هێشتانەکێ نەمدیوە، نازانم ڕۆژێ لە ڕۆژان بە دیدارە شاد دەبم یان نا)! پاشان خۆی داچەماندەوە بچکۆڵی ماچ کرد، بە دەستەخۆم نەبوو گریان هەوکی گرتبووم، هەر مابوو لە سەڵای گریان بدەم، پاشان قالە بەراز لە نەعرەتەی

داو هاواریکرد..!(کوردستان گۆڕی دوژمنانه) . ئیدی بەری خۆی دا دوژمن ملی پێوه نا، دەتگوت بۆ پێشوازی بووك گواستنەوه دەچێ . دەنگی ڕەشاش بڕێنەکەی وەکو قاسپە قاسپی نێره کەوی (کێوی قەره سرد) ه کاتێ کە بەره بەری خۆر هەلاتن لەسەر تاشه بەردێك دەخوێنی، هەرچی کەوی خەوتووی ژێر بنه تەڕاش و تاشه بەردان هەن بە ئاگایان دێنی، بە پێرۆو باڵەفڕکێ دەکەون، شەڕگەرم بوو. گولله لە ئاسمان گوللەی دەقۆزتەوه، سەدای قازیفەو هاوەن و دەنگی بڕنۆو قاسپە قاسپی ڕەشاش برێن و نەعرەتەی پێشمەرگەو گریان و هات و هاوارو

(یومەو یابە)ی بۆق خۆرەکان تێکەڵ بەقاقای پێکەنینی بچکۆڵ دەبوو،خۆریش پەیتا پەیتا بەرەو ئاوابوون دەچوو،وەکو ڕۆژی(حەشر) وابوو،

دوژمنیش بە پاشەڵی بە خوێن لە تەشکی خۆیاندا فشیانکردەوه.کوشتار زۆر بوو. چەند سەربازێك بە دیل گیرا بوون، ئیدی تاریکی کەوته عاردی سێ ڕستە گوللەی ئاگر بۆئاسمان بەڕێکرا. نیشانەی گەڕنەوەمان بوو. دیلە کانیشمان داپێشە خۆمان گەڕاینەوه.. نازانم لە کاتی گەڕانەوەماندا باسی چت بۆ بکەم، هەتا ئەو ڕۆژەی سەر دەنێمەوه بە خاکم دەسپێرن هەرگیز ئەم هاوکاری و پشتیوانییەی گوندنشینەکان لە یاد ناکەم، هەر من دەزانم چەند بە هەڵوێست و شەڕەفمەندو ڕۆح سوك و تێنووی ئازادی بوون. لە گەڕنەوەماندا دەگەیشتینە هەر گوندێك.! ئافرەت و پیاو منداڵ هاتبونە پێشوازیمان خواردنیان ئامادەکردبوو، دیلەکان، عادزو خەمبار بوون، ڕەنگی ڕوویان پەڕیبوو ناحەقیان نەبوو دەترسان زەندەقیان چووبوو، نتقی گفتوگۆیان نەبوو، کە خواردنیان دەهێنایە پێشمان، دیلەکان دڵیان پڕبوو، ئاگایان لە برسێتی نەمابوو دەستیان بۆ خواردن درێژ نەدەکرد، دەیانگوت: برسیمان نییە بۆمان ناخورێ، بەلاّم بە هەر حاڵی هەبوو لەگەڵ خۆمان لە سەر یەك سفره دامانتان. دەستمان لەناو یەك لەگەن بوو هەتا تێرمان خوارد، باشبوو(بێن) یان هاتەوه بەر ترسیان شکابوو، ناوەناوه دەماندواندن. پرسیارمان لێدەکردن. ناوت چییه.؟! ئاکنجی کامه شاری.؟! سەر بە کامه لیوای سەربازی.؟ چەند ساڵە لە خزمەتی سەربازی دای.؟ ژنت هێناوه..تد. یەکێك لە دیلەکان ناوی (حەنەش) بوو، هاتە گۆ گوتی:

له ڕاستی دا ئێمە بە تەمای ناخواردن نەبووین، چاوەڕوانبووین کەی لە دۆڵەکی ساردمان دەکەنەوە پێدا چوو گوتی:

تێناگەم.! خەریکە مێشکم وەختە بتەقی، چونکی ئێمەیان واتێگەیاندووە..نەمهێشت قسەی تەواو بکات پێمگوت:

ئێوەیان واتێگەیاندبوو کە ئێمەمانان دڕندەی ئینسان خۆرکەین. ئینسان دەخۆین وانییە.؟! نا.. یارۆ، ئێمە لەم کردەوانە بە دووریـن. بەلاّم کاتێ گەورەکانتان دەیانەوێ ولاّتمان لێ داگیر بکەن. دەستدرێژی بکەنە سەر ناموس و کەرامەتمان بشکێنن و خوێنمان بڕێژن، ناچار دەبین بەرگری لە خۆمان و لە نیشتمانەکەمان بکەین . بەڵێ دەیانکوژین، چونکی ئەوان هاتوون بیمانکوژن، ئەگەر نەیانکوژین.! بێگومان دەمانکوژن، ئەگەر هەر نەگەڕانەوە.! سەریان لە لەشیان جیا دەکەینەوە. لەتوپەتیان دەکەین بە جەهەننەمیان دەسپێرین، بەلاّم دڵنیابن ئەوەی لە گوڵ گرانتر بێ بە (دیل) ناڵێین.

: پەیامنێرەکی بیانی ئەوروپا نوسیبووی.! (حکومەتی بەغدا بەرامبەر بە کوردە یاخیبووەکان لە چیاکانی کوردستان شەڕێکی گەورەو درێژ خایەنی بەرپا کردووە. بەلاّم دووچاری شکست و دەغەزار بووە لە دەستیان، بە هیچ نەخشەو پلانگێڕان و پڕوپاگەندەی ژەهراوی لە دڕوستیان نایەت. گوایە ئەو یاخیبووانە بە ڕۆژ لە زەندۆڵ و کەلێنە شاخ و ئەشکەوت خۆیان حەشاردەدەن.کەچی لە گەڵ ئەنگۆرە بوونی هێواران دا. وەکو(مێمل و جنۆکە و ڕموزن) لێیان دەردەپەڕنە دەرەوە کارێکی وایان پێدەکەن زیرەیان دەگاتە ئاسمانی حەوتەمین، حکومەت، بۆ ڕیسواکردن و ناوزڕاندنیان، ناوناتۆرە بوختانیان بۆ هەڵبەستاون، بە دز/جەردە/ڕێگر/بەکرێگراوی بێگانە/بەخوێن ڕێژ تۆمەتباریان دەکەن.

لە هەمووی سەیر تر بەشەمشەمە کوێرە ناوەزەندیان کردوون).

## بەشی بیست و چوار

عەفلەقیەکان و ئەوانەی پێشەوانیش،ئەگەر چی لە کورد کوشتن و کاولکاری دا (وەستا) بوون درێخیان نەدەکرد،بەلاّم لە ئاست ورەی بەرزو پۆلاّینی پێشمەرگەی کوردستان دا دەستە پاچەو سەراسیمە ببوون،لەگشت بەرەکانی جەنگ شکستیان هێنابوو،دەستیان لە بنی هەنبانە بۆرینەدا دەرچووبوو، سفربەدەستبوون، بۆیە لە پێنا و مانەوەی خۆیان لە سەر کورسی دەسەلاّت، ناچاربوون کە سەر بۆ داخوازییەکانی سەرکردایەتی سیاسی بزاڤی ڕزگاریخوازی گەلی کوردستان داچەمێنن.

ئاابی..کە ڕۆژێکی خۆش بوو، ڕۆژانی ئاشتی و ئاشتەوایی، ڕۆژانی سەرکەوتن، ڕۆژانی شادبوونەوەی خۆشەویستان و یەکدی لە ئامێزگرتن هەرگیز لە یادناکرێ،دێ، بەدێ، شار بەشار، ماڵ بە ماڵ، گەڕابای.! هیچ چارت نەبوو دەبووایە دوو فرمێسکی گەرم بۆ گەورەیی و شکۆمەندی شەهیدان، بۆ ئاشتی هەڵبرێژی، لە وان ڕۆژاندا لە بەختەوەریان گشت گیانم (لیر)ی دەرکردبوو لەخۆشیان،لەدەرونەوە دەکولاّم.هەلاّوەی گەرمی هەناوم بلّقی دەدا،بەلاّم هەست و سۆزی

دووری لە خۆشەویستان دەستی دەنایە هەوکم، وەکو منداڵی ساوا ئاسای نزگرەم دەگرت، نازانم سۆزو گڕی ئاگری چ عەشقێك بوو.؟! وەکو ئاگری بن کا. لە نا و هەناوم وە بنی دەداوە بڕستی لە بەرم بڕی بوو. ناچار ڕووم لێنان .!!

: کوڕگەل،ئێوە خەریکی بەزم و ڕەزمی هەلپەرکێ و شایی ڕەشبەڵك و شێخانی و سوسکەیی و تەمبۆڵێ بن،گورانی بۆ ئاشتی بچڕن منیش.! سەفەرێکم کەوتۆتە پێش دەڕۆم سەردانی ئازیزان دەکەم، ئەو هەموو زەحمەت و ماندوو بوون

و شەو نخونی و شەکەتیەی چەند ساڵەی ڕابردووم بە سەر خەوێکی خۆش و ئارام لە باوەشی نەرم ونیانی زینۆخان دا بۆ هەتا هەتایە گشتی فەرامۆش بکەم.

تومەز زینۆخان چەند ڕۆژبوو لە چاوەڕوانی دا پێیەکی لە دەرەوە بوو، پێیەکەی دیکەی لە ژوورەوە بوو . دەهاتو دەچوو چاوی بڕیبووە دەرگای حەساریٚ . کاتیٚ کە دیتم لە ناو شورەی گۆڕینەدا چاوە چاوو سەرە تاتکێیەتی،ڕۆژانی دلّداریم هاتەوە یاد، وەی خودایە چەند خۆش بوو، هەناوم کزاوە بۆ کڕوزی لیٚهات، هەر بەیادی ڕۆژانی ڕابردوو لە دوورا سلاّوێکی عاشقانەم لیٚکرد.! ئەویش هەر بەیادی جاران وەلاّمی سەلامی دامەوە، ئەوەی بە لامەوە مایەی سەر سوڕمان بوو.! ئەم چەند هەنگاوەی لە نێوانمان دا مابوو بەیەك بگەین، هەرچەندی تەکانم دەدا بەر خۆم کەچی پێموابوو کە نێوانمان لەباریەك دەکشاوە، لە پێشم ببوە هەورازەڕیٚ. ئیدی لە پێش چاوی دانیشتوانی حەساریٚ هامێزمان بۆ یەکدی گرتەوە، یەکدیمان لە باوەشگرت، لە دلّی خۆمدا گوتم:

: ئۆخەی .ئێستاکیٚ ئەگەر بشمرم.! سوویٚم لە خۆم نابێتەوە. زینۆخان.تاسابوو،دەمی ببوە تەلّەی تەقی، زەق زەق

تەماشای دەکردم، نتقی قسەی نەبوو، گریان لە هەوکیدا مابوو، لێوی بە تەتەلّە کەوتبوو هەرمابوو لە هاڕژنی گریان بدات. دەستم گرت بە هێواشی چوینە ژووریٚ، دیار بوو هێشتانەکیٚ لەبەر سۆزی دووری گریان بە سەریدا زالّ بوو. لە پڕمەی گریانی دا سەری بە باوەشم کرد، کاتیٚ کەسۆزی گریانی دامرکاوە پرسیاری (هیوا) م لیٚکرد.پیٚکەنی .

پێکەنینێکی ئەوەندە خۆش پێکەنی، لە ناخەوە پێدەکەنی . نەمهێشت پێکەنینەکەی تەواو بکات لێی ڕووهاتم گرتم لە بنە خۆمنا، وەکو دوو هەرزەکاری قۆشمە کەوتبوینە ململانیٚ و گەوزە گەوزانیٚ. تاکو شل و کوت بووین یەکدیمان هێناو برد، ناوەناوە لە هیکرا ماچێکم لە کولّمەی دەکرد، بەلاّم چ ماچ.! دەمم دەنایە گەردەنی، دەمم هەلّنەدەگرت تاکو خوێنی تێدەزا دەممژی، دواتر هاتەگۆ گوتی(نەیەڕۆ بابانم. کورە بەرمەدە شورەیی یە وا (هیوا) تەماشامان دەکا شەرمە). خۆی لە بن دستم ڕاپسکاند گوتی:

-کابزانم ئەو وێنەیەی بە دیوار هەڵواسراوە دەیناسی.؟! لە وێنەکە چوومە پێش، وێنەی لاوێکی قۆز، بە جل و بەرگی ئەفسەری، گوتم:زینۆ گیان. هەوە خۆیەتی. کاکە هیوایە. سوبحانەللاّ چەند جوانە.. لێی وەرگرتەوە گوتی: لە چاوی پیس و بەدکار بە دوور بێت، لەم ڕۆژانە بە مادۆنی دێتەوە. دڵت نایە تەماشای بکەی.لە دڵی خۆمدا گوتم:

دەزانم کاکە هیوا لاوێکی چوارشانەو توندو تۆڵە نەخاسمە ئێستاکێ بەپۆشاکی ئەفسەری. هێندەی دی گورج و گۆڵ و چەلەنگ بووە، بەلاّم دەترسێم وەکو (دوڕ)ەکەی هەیاسی دوڕناس بە ڕواڵەت جوان و کەچی ناوەوەی کرمی بێ..لەم نانەدا زینۆ مەسینەو دەست شۆری هێنا داینا. گوتی:دەستت بشۆ با نانەکەمان بخۆین. وەکو جاری جاران لەلەگەنێکی دوو کەسی پڕ خواردن هێنای داینا. بە دووقۆڵی دانیشتین هەتای تێرمان خوارد،پاشان لەبەر کشاینەوە، دواتر دووچای شیرنی بۆم تێکرد، ئێجا هەستاوە چوو دەستێکی بەناو ماڵەکە هێنا، دەفرو قازان وهیربارو هەرچی هەبوو جوان شوشتی ویەك یەك خستیەوە شوێنی تایبەت. (کەیبانووی چاك . دوای نان خواردن تاکودەستێك بەناو ماڵەکەی دا نەگێڕی هەرگیز بێنی نایەت) دواتر چاوم لێبوو.! پرچ و پەرچەم و هندامی خۆی ڕێکخستەوە هات شان

بە شانم دانیشت، نیدی بە دەم گفت و گۆو باس و خواسی دنیا لە نووکەوە لە سایەی ئاشتی و ئازادی دا، نەخشەمان بۆ ژیانی داهاتوو دادەڕشت، چیبکەین باشە.؟!

# بەشی بیست و پێنج

دنیاگۆڕنکاری بەسەردادێ،جاری وایە تۆ لەگەڵ ئەو گۆڕاننکاریانەدا دەگەیە ترۆپك.جاری واش هەیە تێت هەڵدەدات لە قوڕێت دەباتە خوارێ.لە بنت دێنێ.گرنگ ئەوەیە مرۆ لەژیانی دا ڕابردووی خۆی لە بیر نەکات.هەردەم ڕابردووی خۆی لە پێش چاو بێت. نەك سەرچیغ بداتە بەرێ . چونکە مسۆگەر بزانەلە ئاییندەیەکی نزیکدا خراپ بە سەرتدا دەشکێتەوە.نیدی هەرچەندجاری (هیوا) بە مادۆنی دەهاتەوە.لشیرازەی ژیانمان لە بار یەك دەچوو،چونکی هیچ حیسابێکی بۆ ماندوبوون و شەوخونی من نەدەکرد، بۆ ئەو هەمووساڵەی لە پێنا و دەستەبەرکردنی مافی ڕەوای چارەنووسی گەل و نیشتمانەکەم لە سەنگەردابووم،کاتێ کە دەکەوتینە گفت وگۆو دەمەتەقێ.! هەردوکمان وەکو دووپارچە ئاسنی پۆلاً.مکوڕبووین لە سەر هەڵوێستی خۆمان. (کێرد)مان لێکدی دەساوی هەروەك ئەوەی بلێی :

کوڕی ئەم باوکە زەحمەت کێشە نەبی.ئەوەی یەکجار بێزارو لە ناخەوە برینداری دەکردم.ئەوە بوو کە دەیگوت.! ئێوە بە دوای قەلقەلاشکی بابردووکەوتوون.چونکی کاروانی شۆڕش بە تەمای (بەڕو) خواردن ناگاتە ترۆپك لە نیوەی ڕێگا بەچۆك دادێ.

: ڕیکەوتنامەی ئاشتی لە یانزەی ئاداری ساڵی حەفتا،بەڕادەیەك زامو برینی ئێراقییەکان بە گشتی و گەلی کوردستان بە تایبەتی سارێژ کردبووەوە.مەڕو گورگ لە یەك دەراو ئاویان دەخواردەوە، ئاژەلە کێوی بەبێ ترس و سلەمینەوە بەرەوە دەهاتن لەڕۆخ ڕووبارو کانیاوەکان ئاویان دەخواردەوە و دەلەوەڕان، باڵندەکان ترسیان نەبوو، پێت لە کلکیان نابایە هەرگیز خۆیان لە گورە نەدەبرد

دڵنیا بوون، چونکی تام و چێژی ئاشتیان چەژتبوو نەدەترسان.
بێگومان عەفلەقیەکان. لە سایەی ئاشتی دا پەروباڵیان هێنابۆوە بە خۆ کەوتبوونەوە. هێشتانەکی ساڵێك بەسەر ڕۆژی ئاشتی دا نەسورا بووەوە.! هەڵپرستانە وەکو (سیخور) خۆیان گف دەکردەوە، وابوو لە ڕۆژی(١٩٧١/٩/٢٩) پەردەیان لە سەر ڕووی ڕش و شووم و دزێوی خۆیان لادا، ئاشکرا بووچەند دژە ئاشتین.. بەلاّم لەگەڵ ئەوەشدا پشی درێژی و هێمن و ئارامی و مەزنی (ئەو)کەلەمێرە کوردە لە پێناو بەرژەوەندی بالاّی گەلی کوردستان دا نەیهێشت جام بزرنگێ .. وەلێ مەخابن هەر بێسوود بوو، چونکی (بزن دەست نوێژی پێرا ناگیرێ)، لە لایەکی دیکەوە ڕۆژنامە
ڕووزەردەکانی دژە ئاشتی و ئازادی کەتنەوە بە (با) کردنەوەی کۆنەکا، عەفلەقیەکان بەم بەدکاریانەش کفتایی دڵیان دا نەکەوت، بە پەلە پرووزە و هێنکە هێنك ئاوەڵکراسی بووکی کەنداوی عەرەبیان لە پایتەختی وڵاتی(جەزائیر)ەوە پێشکەش بە شاهەنشای فارس کرد بەرامبەر بە پەڕو باڵ کردن و خنکاندنی کۆتری ئاشتی. دیسان شەڕ قونی خۆی هاوێتە حەوشەو دەرگای لێگرتینەوە، بەلاّم شەڕ چ شەڕ شەڕێکی نالەبارو پڕ پێست و بە دڵی بەکرۆکەو ناحەزان و دوژمنانی ئاشتی و ئازادی بوو.. گرفت ئەوە بوو.!
زینۆ..کەمێك نەساغ بوو، هیوا لە ماڵ نەبوو،سەرم تێچولابوو، نەمدەزانی چیبکەم،؟! بەخەمدا کەوتبووم، ئەگەر دەڕۆم.؟! لە مەراقدا دەمێنم، ئەگەر ناڕۆم.؟! لە کاروان بە جێ دەمێنم، ئەگەر دەستی زینۆ دەگرم و یاڵڵە.! دەترسێم لە بەر جگەر گۆشەکەی پێ سەرگران بێ، چونکە دایکە،لە لایەکی دیکەوە بیرم لە ڕەفتاری جەنابی (ملازم هیوا)
دەکردەوە.! (ئێوە بە دوای قەلقەلاشکی بابردووکەوتوون). بەڵێ ئەم سپلەیە نانی خیانەتکاری خواردووە، هەرکاتێك بۆی برەخسێ مسۆگەر دەستناپارێزێ.نەخێر کات بە فیرۆدان سوودی نییە، بەلاّم هەرچی زینۆ بوو لە خەمی تاراندنی ئاشتی بوو، لە حەیبەتان بوو کەوتبووە ناو نوێن، ئەویش تێمابوو های لە جەرگ های لە دڵ کامیان هەڵبژێری.! لە دڵی خۆمدا بڕیارم دا، تا کار لە

کار نەترازاوە وا چاکە نامەیەك بنووسم بۆ مـلازم هیـوا. (هیواگیـان..دیـسان گەورەکانت مەیلی خوێن ڕشتن لەکەللەی داون، بەرچاویان تاریك بووە،چاویان لـە ئاست خۆرە تاوی ئاشتی و ئازادی هەڵنایەت،خوێن بەری چاویانی گرتووە، مەیلی شـەڕانگێزی لـە دڵ و دەروونیانـدا چـەکەرەی کـردووە، بۆیـە دیـسان (پـەتك)یـان پساندەوە دەزەڕن، هیوا.!دایکت نەخۆشە چاوت لێـی بی،نەگەرلـە بەرتۆنـەبێ بـە جێیی ناهێڵم،

حەزدەکەم بزانی کە من هەر ئێستا دوای نووسـینی ئـەم نامەیـە دەڕۆم بـەرێ دەکەوم، هیوا، دەبێ ئەوەشت پێ بڵێم.! کە تۆ خزمەتی داگیرکەر دەکـەی، داگـیر کەر حسابی بەکرێگیراوت بۆ دەکەن، نەك نیشتمان پەروەر هەر هێندەت خۆشـییە تاکولێت داوێنە مـلان، بۆیـە هـەر کاتێـك کەوتیتـە تەنگانـە، ئەگـەر حـەزتکرد بەرگری لەگەل و نیشتمانەکەی خـۆت بکـەی، دەسـتی دایکـت بگـرەو کوردسـتان نیـشتمانی هـەموو کـوردێکی بـە شـەرەف ودڵـسۆزە.لـە کۆتـایی دا بەئومێـدەوە چـاوەڕوانم لـە سـەنگەری شـەرەف و کەرامـەتی نەتـەوە و نیـشتمانی دایـك پێـك شادببینەوە نەگەر نا.! سێرە لێکدی گرتن شتێکی زۆر ئاسایی یە) زینـۆ، زۆر بـە هوردە و هوردبین بوو، گۆریەو بەلەکپێچ و پەستەك و خەنجەری بۆم ئامادە کردبوو ملاکێك دۆنی هێنا لەکەوشەکانی هەڵسووی.توێشووی سەفەری لە پریاسکەیەکدا پێچابوو، گوتی(نان هاوڕێی سەفەرە، بە کەلکت دێ.ئیدی بـە هـەر حـاڵی هـەبوو ماڵئاواییم لە زینۆکرد.هێشتانەکێ شەو وە بەریەوە مابوو بە ڕێکـەوتم، شـەوێکی ساردو دژوارو ئەنگوستە چاو بوو، بەلای خۆر ئاواوە هەورێکی بۆری چلکن بـەری ئاسمانی گرتبوو دەهات،ناوەناوە لە هـاڕژنی دەدا دەیـشریقاند، مەپرسـە، گرمـەی دەهات. کەچی لەلای خۆرهەلاتـەوە بایـەکی سـاردی دەهـات دەتگـوت: گوێزانـە بەرووی مرۆ دەکەوێ . بەلام ساردو گەرمی و ئەنگێزە و باو بۆران، هەورازو نشێو ڕیگە لە هاواری دایك ناگرێ. نەسڵەن ڕێگەی پێناگیرێ .. تۆ وادەزانی هـەر مـن بە ڕێگاوە بووم. نازانم تۆ بە کۆچی باڵندان ئاشنای.؟ دیتوتە لـەو کاتـەی کـە بـە ڕەوە گەرمیان و کوێستان دەکەن.؟جەماوەر ئەوها بەم شێوەیە بوون. بـەرەو خـۆر هەلات کۆچیان دەکرد،خۆشی لەوەدا بـوو.! کەسـێك نـەبوو مـچومۆڕو نیوچـەوان

گرژو دڕدۆنگ بی، ئەو خەڵکە بە گشتی خەندە لێو بوون،وەك ئەوەی بڵێی:بۆ زەماوەند و گەشت و گوزار و سەیران بچن، ئیدی دوای چەند ڕۆژە ڕێ عەسرانێکی درەنگ بوو کاتێ کە بە بچکۆڵ و قالە بەرازو هاوڕێ و هاوسەنگەران شادبوومەوە، ئیدی ما بپرسن کێ هاتۆتەوە کێ نەهاتۆتەوە.!؟ بچکۆڵ پێکەنی گوتی: لالۆ. تۆ خەمی هاتنەوەی ئەوانت نەبێ گرفت نییە،گرفت ئەوەیە ئەوەی هاتۆتەوە بە خاوخێزانەوە هاتۆتەوە، وادەزانن بۆ سەر داوەت و زەماوەند بانگهێشت کراون، تۆ بلێی: ئەم هەموو زارۆیە چییە بەدوای خۆتان داون، ئای قوڕت بەسەر(عەبە ئازووقە) چۆن ئازووقە بۆ ئەم هەموو ژن و منداڵە دابین دەکەی..! قالە بەراز لێی هاتەدەنگ پێی گوت:

-هەتیو، پێمنالێی تۆ سەری سیری قونکی پیازی چی.؟! ئازووخە. ئازووخەت بەدەم گرتووە، قابیلە ئازووخەی ماڵی باوکتە، خۆ ماڵی باوکت نییە.لبچکۆڵ لێی زیت بووەوە باگۆی داوە.!

-ئەرێ وەڵلاّ. ئازوقەی ماڵی باوکمە، ئەی چۆن. لەم بەزم و ڕەزمە دابووین، منداڵێکی خڕینی چاو شین هاتە ژوورێ. بچکۆڵ بەرزە پێ هەستاوە خۆی لە پشتە من ماتکرد.گوتی:

-لالۆ دەخیلت بم نێلی بم خوات.! چاوم گێڕا، هەستم ڕاگرت هیچ لە ئارادا نەبوو،

- چی دەتخوات هەتیو،؟! ئاماژەی منداڵکەی بۆمکرد گوتی: ئەم (کودیلە) بێچوەبەرازە دەمخوات. تومەز ئەم منداڵە کوڕی قالە بەراز بوو، ئیدی بە دەستە خۆمان نەبوو لە قاقای پێکەنینمان دا، قالە بەراز لە حەژمەتان لێوی خۆی

دەکرۆژتەوە، لە بەر ئەوەی بچکۆڵ خۆی لە پشتە من نابوو،نەدەکەوتە بەر دەستی تاکو تۆبەی پێبکات. دواتر بە هەر حاڵی هەبوو قالەمان هێور کردەوە. پاشان نۆرەی قالە بەرازبوو پێدەکەنی، پێکەنین گرتبوی بەری نەدەدا.

لە هەموو بەرەکانی جەنگ دا شەڕ دەستی پێکردبۆوە، شەڕ گەرم بوو، داڵە کەر خۆرەکان پەیدا ببونەوە.بە ئاسمانی شەڕدا دەسوڕانەوە، بازرگانانی شەر وەکو قەلەموون ئاسای خۆیان گیف کردبووەوە، دەیوسەکان لە خۆشیان باوێشکیان

دەهاتێ، حەقی خۆیان بوو باوێشکیان بێتێ، چونکو بەیاننامەی ئاشتی لە یانزەی ئادار، نان برای کردبوون . ببوون بە پەرۆ بێنوێژی، تیاترۆکانی تیا ترۆخانەی گەڕەکی(دەواسە) لە شاری مووسل. ڕۆژێکی تەنگەبەرو لێل بوو، شەوان کە تەماشای ئەستێرەکانی ئاسمانی ولاتم دەکرد، کزومات،بێ ڕەونەق پرشنگیان لەبەردا نەبوو، دیار بوو ئەوانیش هەر لە خەمی تاراندنی ئاشتی دابوون. لە گشت بەرەکانی شەڕدا، لێکدادان و پێکدادان بوو، حکومەتمان هێنابووە سەران، سەریان لێ شێواو بوو، بە دووربین تەماشامان دەکردن، کاتێ کە هێرشیان دەهێنا بۆ سەر سەنگەرەکانی پێشمەرگە،دەماندیتن.! ئەفسەرەکانیان بە شوورە دار دەکەوتنە وێزەی جاش و سەرباز. وەکو ئاژەڵ بە پێشە خۆیان دەدان،بەلاّم هەر هێندەیان خۆشی بوو، هەتالێیان دەهاتینە دەست و بە خۆ دەکەوتین، کەسیان نەدەبووە برای کەس، هەر بابا بڕو خۆی لە چنگی هەڵۆکان ڕزگار بکات.. ئیدی ڕۆژ نەبوو بە چەندانیان لێ بە دیل نەگرین، یەك.یەکو. دوو، دوو سەرباز خۆیان دەدزیەوە دەهاتن خۆیان دەخاڵەتی پێشمەرگە دەکرد، لە زاری دیلەکانەوە پێدەکەوتین.! چ ترسێکی بە سام کوشندە لە دڵ و دەروونی سەربازانی داگیرکەر چەکەرەی کردووە. ورەیان دابەزیوە، شلۆقیان تێکەوتووە، دەستوەکەریان پێناکرێ، بەلاّم لە بەر زۆری و ئەستوری سەربازو جاشی بە کرێگیراو هیچی پێوە دیار نەبوو، چاومان لێ بوو لە کاتی هێرش و پەلاماردان(جاش)ە خۆفرۆشەکانیان وەکو دیوارو زریپۆش لە ڕیزی پێشەوەیان دادەنان. چونکی حیسابی سەگی ڕەش و سەگی سپیان بۆ دەکردن.

# بەشی بیست و شەش

لە ڕاستی دا شەڕی مان و نەمان بوو، بڕیاری شۆڕش بوو بێجگە لەدیل. ئەگینای دەست نەپارێزین. کوردە، کورد نییە مادام جاشە چاوی دەردەهات، وەکو گەڵای دار لێمان هەڵدەوەراندن.ئێوارە بووبچکۆڵ هات پێی گوتم:

-کەسێك لەناو حکومەتەوە هاتووە، دەخوازێ بێتەلات.

-بلا بفەرمووێ

دوای پشوودان و شێوکردن، کەسی میوان نامەیەکی دایە دەستم، نامەکەم کردەوە نامەی(ملازم هیوا) بوو،لە کۆتایی نامەکەدا نووسیبووی.!

(باوکە. هەڵبەتە لە بیرتە پێمگوتی: ئێوە بە دوای قەلقەلاشکی بابردوودا ڕادەکەن. لەوانەیە ئێستا بڕواییت هاتبێت، بۆیە دواجار لە بەر خاتری دایکم.! داوات لێدەکەم هەتا کار لە کار نەترازاوە،وەرەوە بۆ ژێر حورمەتی یاسا، ئەوەش بزانە کەبەڵێنم داوە بە دایکم،لەگوڵ گرانترت پێ نەڵێن، ئیترچاوەڕوانی وەڵامی جەنابتم. .ملازم هیوا، بەهاری(١٩٧٤).

لە دڵی خۆمدا گوتم: بالەناو دوو نانی گەرم دا بۆت بێنی هیوا هەتا ڕۆژت دادێ، هەنگێ لێکدی دەپێچینەوە ئاخۆ کامەمان بەدوای قەلقەلاشکی بابردوودا ڕادەکەین.

گەلۆ..هەرچەندی تاوتوێی دەکەم شنەبای دەکەم، لەسەرەندو بێژینگی دەدەم،کەچی هەرتێناگەم ئەو خۆشەویستیە چ خۆشەویستییەکی ئەفسوونایە والە مرۆ دەکات.! کوڕوباب سێرەی تفەنگ لێکدی بگرن،دەست بنێنە بێنا قاقای یەکدی. ؟!

باوڕبکە لە ژیانمدا نەترساوم، بەلاّم قەت هێندە نەترساوم، بەتایبەتی لەم

ڕۆژانەدا باریکەترسێك کەتۆتە دڵم، ناوەناو

ترسەکە دەتریوێنێ، هەست پێ دەکەم لەناوەوە ئەستوور دەبێ دەپەنمێ. ناوێرم پێ لە بەر پێ بنێم، زۆرجاران بە خۆم سەرکۆنەی خۆم دەکەم.! تۆ. کەی هێندە لاوازو بێ هێزو قەلە زراوبووی.؟ هەی داوەشێی پیاو.شەڕ تیر ببوو، تیری تێنە دەچوو، جاری وادەبوو لە هەندێ شوێنان وەکو فیلمی سینەمایی تێکەڵ دەبووین،بەلاّم خۆشییەکەی لەوەدابوو.اپێشمەرگەکان. وەکو کارەکۆرپە ئاسای لە پشتە ملی سەربازەکانیان دەگرت دەیانهێنان. جارێکیان قالە بەراز، بە هەردوودەست پشتە ملی دوو سەربازی گرتبوو دەیهێنان، ڕەشاش برێنەکەی خۆی و هەردوو کلاشنکۆفی، سەربازەکانی حەمایل کردبوو. وەکو بەراز دەیفیشکاند. مردووت لە گۆڕێ بووایە لە قاقای پێکەنینت دەدا،

(لەو قسانەدابوو، دەتگوت لە غەیبەوە لەمە چێتر قوڕگیان گرت، پشی هەڵما. نتقی گیرا، ئەلفازی نەگەڕا، ڕەنگی ڕووی سور هەڵگەڕا، ئارەقەی شین و مۆری کرد، چاوی زەق لە مۆلەق دامابوو، ئەتدەوێرا تەماشای ناو چاوی بکەی ئەوەندە بەسام بوو، ڕابووم پەرداخێك ئاوم هێنا،ئاوەکەی خواردەوە. جگەرەیەکم بۆی داگیرساند دامەدەستی بەتاسووقەوە هەڵیدەمژی، لەگەڵ مژینی جگەرە و دووکەڵ بەباکردن هاتەوە سەرەخۆ، دواتر لە ناخەوە هەناسەیەکی هەڵکێشا بۆ کڕووزی لێدەهات).پاشان هاتەوەگۆ پێداچوو گوتی:ڕۆژێکیان نازانم چ ڕۆژێکی شووم و بەدێوم بوو، نازانم

شەممەی جولەکان بوو، یەکشەممەی دیانان بوو،هەینی موسڵمانان بوو. نازانم چ ڕۆژێك بوو.!!هەرهێندە دەزانم لە بارەگای سەرکردایەتی شۆڕش بررووسکەیەکمان پێگەیی..!

: زۆر جاری وابووە لە چلە پۆپەی زستانێ . یان لە ناوە ڕاستی کانگەی بە هارێ دا، لە هیکڕا دەیکاتە هەورو هێرو باپووسکە و تەمو مژوگرم و هۆڕی هەورە تریشقە و بلاچەی برووسك لێدان و دواتر دەیکاتە شەوە زەنگ . بلاّچەی ئەم بروسکە لێدانە هەر شوێنەکی بگرێتەوە هەلابە هەلاو تەرت و وێرانی دەکات.. ئەم برووسکەیەی لە بارەگای سەرکزدایەتیەوە بۆمان هات. هەلابە

هەلای کردین، لە بن بۆتکەوە بەندی جگەرمانی هەڵتەکاند، داغـان بـە داغـانی کردین. سەری لێمانشێواند، هەڵلایەك بەرپابوومەپرسە، کەس بەکەس نەبوو،کەس لە کەس نەدەگەیی،کەس بەزەیی

بەکەس دا نەدەهاتـەوە. لێپێـچانەوە نـەبوو، هـەر هـەموو ڕوو گـرژوو مـۆن، دڕدۆنگ. داتلەکای..ئای.. کە ڕۆژێکی تـەنگ و دژوارو نـاخۆش بوو،قـەت لـەم بڕوایـەدا نـەبووم ڕۆژێ لـە ڕۆژان ڕۆژمـان بـەم ڕۆژە بگـات. پێـشمەرگە تـاکو تەرا..دەستە دەستە..بە کۆمەڵ بەڕێوەبوون، هەندێکیان بە نابەدڵی بەرەو خۆرئاوا ملیان نابوو، هەندێك بەرەو خۆر هەڵات سـەری خۆیان هەڵگرتبوو تـوڕە و تۆسـن. سوخت و بێزار بەرەو چارەنووسی نادیار قەتارەیان بەستبوو بەڕێوە.(ئەو ڕۆژە بـوو کە خائین و خۆفرۆش و هەڵپەرستان بە(ئاش بە تاڵ) ناوەزەنـدی دەکـەن. بـەڵام بـا سێری بخۆن زورنای لێدەن، تادەنگیان خۆش بێ، چونکی پیاوی خائین و خۆفرۆش و سووك وچروك و پاکاری داگیرکەرانی کوردستان هەرگیز دان بەو ڕاستیە دانـانێن. لە بەر ئەوەی تـەلاقیان دەکـەوێ .بۆیـە قـەت بـە سـەر زمـان و زارایانـدا نایـەت بڵێن.!! لە پێناوی چەند بەرمیلێك نەوت دا، ئەم کارەساتە پیلانێکی شوومی نێو دەوڵەتی بوو. لە دژی میللەتێکی مافخوراو

. ئاشـتیخوازو ئـازادیخوازو هیـچی تـر.. ئـای کـە دەردی ئـەم هەڵپەرسـتانە دەردێکی گرانە، ئەم نامەردانە .لە ناوەنـدان دەخـۆن و لـە لێـواران پاڵدەدەنـەوە. پێیانوایە کە نەبایە و نە باران، هێندە لووس بوونە قەت تەڕ تابن)

ئای..لەو ڕۆژە ڕەشە پیاوی ئەوهام دەدیت دەگریا.! ڕێی لـە شـێری دەگـرت. تووند گوێی دەگرت بایی دەدا بەرزەفتی دەکرد باری لێبار دەکرد. سـەد حـەیف و مخابن کاتێ دیتم.! قالە بەرازو بچکۆڵ. دەستیان لە ئەژنۆیان وەرینا بوو هۆڕە هۆڕ دەگریان، بە چەپەلۆك لەسەرو گوێلاکی خۆیان دەدا. کوێرایـیم دایێ بۆ ئـەو کەڵـە مێرانە کـاتێ کـە دەچـوونە بەرمەیـدانی دوژمنـان دوژمنیـان دادڕ دادڕ دادەڕی، خۆزیا هەردوو چاوم بڕژابوونایە ژێر پێم.کوێروزەلیل بام،بەڵام قەت. بچکۆڵ و قالە بە ڕازم نەوها نـەدیبان، دوو کۆسـتکەوتە ئامێزیـان لێکـدی وەرێنـابوو کورژەیـان کردبوو، هێندە بە سۆز دەگریان، مەپرسە.! ناوە ناوە لە براڕۆو باوکە ڕۆیـان دەدا.

کافری زندیق بۆیـان لـه دیـن وەدەگـەڕا، دەبـووە ئیـسلام.کەچـی گـەورە پیـاوانی ئیسلام. فەرمانڕەواو پێشەوایانی ئیسلام ویژدانیان نـەجولا. بـە زەییـان بـە دڵـدا نەهات بڵێن: لەل. بەلاّم ئەم هەموو گریـان و ڕۆڕۆیـە بەچـی دەچـێ.؟! (مـردووی خـەڵك، لای خـەڵکانی دیکـە خـەوی لێکـەوتووە. کـێ بـە هاوارتـەوە دێ، ئـەوە هەمووی دەقاو دەق لەم سەردولکە فۆلکلۆرییە دەکات دە لێ:

(ماڵێك باری کرد کەس نەیگێڕاوە. بە خۆم دانیشتم دڵخۆشیم داوە) ئیدی بەر لەوەی بەرەو چارە نووسی نادیـار بـەڕێ بکەوین،بـچکۆڵ.جوتێـك(کـەو)ی جـوانی هەبوو. دەیگوت:ئەم کەوانە کەو(قەرەسرد)ن . باشترین جۆرن. کەوەکانی

خستە ناو قەفەز. لەگەڵ خۆی هێنای کاتێ گەیشتینە نزیك سنووری سـەرابی نێوان عێراق و ئێران. هەر هەمومان پێکەوە ڕاوەسـتاین ئاورمـان داوە. هـەروەك بڵێـی: ماڵئـاوا لـە دایکـی مـەزن بکـەین. بـچکۆڵ دەرکـی قەفەزەکـەی کـردەوە کەوەکانی بەر هەڵدا، کەوەکان بە پێرۆو باڵەفڕە لە سەر تاشە بەردێك گیرسـانەوە. کەمێك خۆیان لە بار یەك کێشاوە . چونکە لە ناو قەفەس سڕ ببوون. بای باڵیـان دا پاشان. بچکۆڵ لێیان چووە پێش گوتی: کەوە خۆشەویستەکانم.! ئێستاکێ ئێوە سەربەست وئازادن بڕۆن. بڕۆن لە جیاتی پێـشمەرگە پاسـەوانی لـە کوردسـتان لـە نیشتمانی کوردان بکەن . کەوەکان نـەجوولان. بـچکۆڵ لێیـان تووڕەبـوو، زۆر بـە توندی تێی ڕاخوڕین.! ئەوە بۆچـی نـاڕۆن.؟! چییە کـەڕن. خـۆ کـەڕ نـین، گوایـە گوێتان لە سەدای دەنگی هاتوو هاوارو کڕوزانەوەی دایکی مـەزن نییـە.؟! چەندە بە سۆز بانگتان دەکـا، دەبـڕۆن دەی. بـڕۆن لـە جیـاتی ئێمـە ئێـشك لـەو شـاخ و کێڵگەو پاوان و ڕووبارو کانیـاوو ڕەزو بنـەدارگوێزان بگـرن.نـەبادا دوژمـن پێـوەر بکات. هەر هەموومان ژن و منداڵ و پـیرە پیـاو پێکـەوە لـە هـاڕژنی گریانمانـدا. بەلاّم گریان بە چی دەچی!.؟! ئەسڵەن گریان کاری بێدەسەلاّتانە، بـە هـیچ ناچـێ، دواتـر کـەوەکان لـە شـەقەی باڵیانـدا بـەرەو مەڵبەنـدی زێـدی بـاب و باپیرانیـان گەڕانـەوە. ئیـدی هـەتا چـاو هەتـەرەی کـرد سـیرەی نیگامـان لێیـان گرتبـوو. خۆزگەمان بە (وان) دەخواست.

## بەشی بیست و حەوت

دواتر بە شلوخاوی بەرێکەوتینەوە تاکو لە بازگەی سەر سنوور، نیگامان لە نیگای ساواك وهەیتەی ڕەزاشا چەقی.دیقەتم دانێ ئەوانەی بەر لەئێمە گەیشتبوونە بازگە.لزۆر بێ نەزاکەتانە چەکەکانیان لێیان وەردەگرتن، چەکیان دەکردن، لە پشترا تەماشات کردبان.لشوێنی خەریتەو فیشەکدان بە ئاشکرا دیار بوو.دوای چەك کردن سواری ماشێنیان دەکردن بازۆ بۆ ئۆردوگا . کە ئەوەم بە چاوی خۆم دیت.! پێشمەرگە چەك دەکران.ڕەزیل وسەفیل دەهاتنە پێش چاوم . تەزییەك لە بنی پێم لە بلاچەی دا دووکەڵ بە کوونە کەپوم دا سەریکرد، دایتلەکاندم. هەر لە جێوە لە سەر چینچکان هەلکوڕمام، بەرچاوم تاریك بوو. ئەگەر چی گوێم لە ژاوە ژاوو قسەو گفت و گۆی حەشیمەتی خەڵك بوو. بەلاّم فرچاوم نەیدەدیت، گوێم لێبوو یەکێك پرسیاری کرد.!

- ئەرێ پێمنالێن گوناحی ئێمە چی بوو.؟دووچاری ئەم مەرگە ساتە بووین.؟!

لەوەرامدا یەکێك گوتی:

-ئۆباب.گوایە ئازانی هێلانەی پەڕەسێلکەمان تێکداوە. خر ئەم قسانەم دەبیست. بەلاّم چاوم فر نەیدەدیت. بڕیارم دا هەر لەوێ بگەڕێمەوە. بەلکو دەردی دڵی خۆم بە دەستی خۆم سارێژ بکەم.!

کەس بەکەس نەبوو، کاروانی پەنابەران و گەڕاوان شەوو ڕۆژ نەدەپساوە. گەرە لاوژەیەك بوو مەپرسە. هەیپام لێکرد ملی ڕێگام گرتەبەر یاغر یاغر گەڕامەوە، حکومەتی عێراق بە مەبەستی ئاسانکاری لەو (عائدون)انەی کەدەگەڕینەوە بۆ ڕیزی نیشتمانپەروەران، لە سەر سنوورو لە بازگەکان لێژنەی پێشوازی کردنیان پێکهینابوو، بەلاّم لە ڕاستی دا لێژنەی چەککردن بوو. دوای ئەوەی چەکیان

دەکردن و نانوسیان دەکردن پاشان چنگێك(قەسپ)یان دەدانێ، بە قەسپ دڵیان دەدانەوە. ئەوانەی سەرپەرشتی بازگەکانیان دەکرد، سەربازو ئەفسەری پلەدار بوون،ئەوان دڵنیا بوون لەوەی کە دەهۆڵ دڕاوە تەقەی براوە، هیچ مەترسی لە نارادا نەبوو، ترسیان نەبوو پشتی خۆیان کردبۆوە.. بەناو حەشیمەتی ئاپۆرای خەڵکی سەر لێ شێواودا دەهاتن و دەچوون پیاسەیان دەکرد، پلەدارەکان بەتایبەتی.من دەمامکی خۆم دابوو، دنیا نەنگۆرە بووچاوم دەگێڕا،(ملازم هیوا) کەوتە پێش چاوم. ئاگای لە من نەبوو، خۆم لێ ئاشکرا نەکرد. گوێم لێ بوو نامەردە بە زمانی غەیرە لەگەڵ گەڕاوەکان دەدوا، تێی ڕادەخوڕین، بە قسەی سووك و چرووك ڕیسوای دەکردن، لە دڵی خۆمدا وتم: قەیدی چییە.؟! مادام کەسێك خزمەتی داگیرکەر بکات و هەڕشە لە باوکی خۆی بکات، بێگومان هەرچی بەسەر زمان و زار دابێ نایگێڕێتەوە. بەملاو بەملادا چاوم گێڕا. دیتم.! لە دووری بازگەکە بەلای خۆرهەڵات لە پەنای گابەردێك (٣) سێ (تۆتیا) یان قیت کردبووەوە بۆ کاری پێویست، لەوێ بەولاوە هەمووی دۆڵ و کەندوونشێوو هەڵەموت بوو. تاریك کەوتبووە عەردی. لەدڵی خۆمدا گوتم: (قابیلە نایەت بۆ سەر پێشاو.؟! ئیدی بە پەنادزە خۆم گەیاندە نزیك شوێنی دەستاو خۆم حەشاردا. هەستم لەخۆم بڕی . ناوەناو سەربازێك بەبەردەممدا ڕێدەبوو دەچوو دادەنیشت، مەپرسە چۆن دەستی لێ بەردەدا، شەوبوو دەنگی دەداوە، کەدەساوە هەڵدەستاوە خۆی توند دەکردەوە، پاشان بە منگە منگی گۆرانی گوتن هێدی هێدی دەگەڕاوە، لە چاوەڕوانی دا چاوم خێل بوو هەر بەدەر نەکەوت، دواجار دەمەدەمی ماڵ خەوتن.! ملازم هیوا بوو، بەپشتی کراوەو بەخشەخشی سۆڵی

لە پێ هێواش هێواش دەهات. هیچ خۆم لە گورە نەبرد، لێی بێدەنگ بووم، چوو لە شوێنی دەستاو چوار چەمکی دانیشت. بە ئەسپایی پارێزم هاوێتێ، هاکا دیتی وەکو ڕمووزن ئاسای لە هیکەوە لە سەری ئامادە بووم. لوولەی دەمانچەم لە کەلەکەی گیرکرد. پەنجەم بۆی توندکرد پەلەپیتکەم ڕاکوشی و لە هارژنی دا، بە پشتداوەڕگەڕا، هەتا سەربازەکان پێ حەسیان و بەخۆکەوتن. من بە دۆڵی دا دۆڵاو دۆڵ بۆی شۆڕ بوومەوە تا بنی گەلی نەگیرسامەوە. پاشان بەرچەڕێی شوورو

بزنه کێوی دا هەوراز بوومەوە. کەتمە ناو ڕەوەز شاخی هەزاربەهەزار، تاریك چاو چاو نابێنیێ، کورم دەویێ بە دوامدا بیێ . شەوی پاشتریش هەر لە چیا مامەوە بۆ بەیانی ڕۆژی ئاینده فیته بەدەوورەم بۆی کرد . خۆم گەیاندەوە کۆچباری پەنا بەران، لە سەر سنوور لە بازگەی ئێران لەگەڵ پەنا بەران ئاودیوی ئەو دیو بووم، لە ئۆردوگای (ڕەبەت) جیێ نشینیان کردین. ئیدی دوای شەش حەوت مانگ لەم ئۆردووگایەدا سەری دنیاو بنی دنیام لیێ وێکهاتبۆوە لەگیانی خۆم وەڕس و بێزار بووم، بیرم کردەوە.! توانای چاوەڕوانیم نەماوە، ئۆقرە ناگرم،

چاوەڕوانی لە چی بکەم.؟! بڕیارمدا بگەڕێمەوە.لە دڵی خۆم دا گوتم: هەرنا بە سەرو سۆراخی زینۆخان دەکەوم، باپێکەوە ئازارو مەینەتی بچێژین خۆشترە. سبەینەکیێ ماشێن ئامادە بوو لیێ سوار بووین بەرەو سنوور بەڕیێ کەوتین، کەلە سنوورو بازگەی ئێران ڕەتبووین گەیشتینە سەر سنووری خۆمان دابەزین، لەسەر ئاوو ئاگربووم، کێچ کەوتبوە کەوڵم، دەمویست خولەکێك چییە.؟! زووتر بە ڕیێ بکەوین، باشبوو کۆستەر ئامادەبوو لیێ سوار بووین بەڕێکەوتینەوە، ئەگەر چی دڵم ترپی تەڕی تیادانە مابوو، بەڵام بە هەڵمژینی هەواو بۆن بەرامی خاکی نیشتمان دڵم فرە خۆش بوو، دوا عەسرانێکی درەنگ کاتیێ گەیشتینەوە مەنزل، لە گۆڕەپانی پارێزگادا دابەزین، بە سەدان کەس لە چاوەڕوانی دا تێکدەقژان، هەبوو هەر بۆ سەیرانی خۆی هاتبوو، هەبوو لە چاوەڕوانی کەس و کاری دا هاتبوو سۆراخی کەسوکاری لە تازە گەڕاوەکان دەکرد. دایکێك کوڕەکەی لە هامێزەی خۆی گرتبوو، ناوە ناوە ماچی دەکردو دڵی دەداوە دەیگوت:

(کوڕم دامەمێنیێ . ئەگەر کوڕ هەبیێ تاریکە شەو زۆرە) لەنکاوڕا هاکادیتم باوکی زینۆ بوو ئامێزی تێم وەرینا.، بەیەکدی شاد بوونەوە، دواتر بە سواری تاکسی ڕۆیشتینەوە بۆماڵ. لە گەڵ دایکی زینۆش پێکدی شادبووینەوە، بەڵام چاوم گێڕا زینۆ دیار نەبوو.! (هێشتا قسەی تەواو نەکردبوو نتقی گیرا لە گۆ کەوت،فرمێسك بەسەر ڕوومەتی چرچ و لۆچی و بەناوڕیشی سپی داخلۆر بوونەوە. سەری لە بەرە خۆ نابوو. بەبیێ دەنگی دەگریا. پەرداخێك ئاوم وێدا خواردیەوە، چایەکیشم بۆی تێکرد لە پێشم دانا، جگەرەیەکیشم بۆی داگیرساند دامە دەستی،

دواتر بەنێولەپی دەستی فرمێسکی لەسەر ڕوومەت و چاوی سڕیەوە، باشبوو هاتەوە سەرەخۆ. دواتر تێهەڵچۆوە گوتی:

بەلاّم من هەرزوو لە داماوی و گفت و لفتی خەزوورم و لە سیمای تەڵخ و ڕەنگ و ڕووی سیس و بێ خولقی خەسووم. دڵم تریواندی.! ئەوەی من لێی دەترسام ڕوویدا بوو، باوکی زینۆ، مرۆیەکی دنیا دیدەدەو زمان پاراو، قسەزان بوو، هەستم پێکرد تێمابوو، نەیدەزانی چۆن.؟ بە چ زمانێك بدوێنێ بە ڕوومدا هەڵێنێ، قسەکانی پچڕ پچڕ بوو، هەستم پێدەکرد گریان لە هەوکی دا مابوو، وەلێ دوا جار کارلەکار ترازا، هەرسێکمان پێکەوە لە هاڕژنی گریانمان دا. بەخۆم بە تایبەتی. ئەوەندە گریام هەردوو چاوم خوێنیان تێزابوو، هەرچەندی ئەم دوو کۆستکەوتە

بەبەرمدا کەوتن.! (ڕۆڵە ئارامت بێ،ئیش لە پیاوان دەقەومێ،خودا بەسەریکردیەوە شوکربە.خودا کەریم و ڕحیمە.)

نەخێر بێهودە بوو، چەشنی منداڵی ساوا نزگرەم گرتبوو. بەم قسانە ژێر نەدەبوومەوە، هێندە گریام تووشی ژانە سەر بووم. وەختبوو هەردوو چاوم دەڕپەڕی بڕژێتە ژێرپێم. ئیدی ئاگام لە خۆم بڕا. بەیانی ڕۆژی ئاینده هەرسێکمان پێکەوە ڕۆیشتین بۆ مەزاری خۆشەویستان، دووگڵکۆی درێژ، چوار کێلی بالاّ بەرز.کوڕ لە باوەشی دایك، بێ هەست و خوست ڕاکشاون، وەکو شێت ئاسای جارێك هامێزم لە کێلی زینۆخان وەردێنا لە باوەش خۆم دەگرت فرمیسك بارانم دەکرد، تاوێ (هیوا) م دەگرتە باوەش و دەنوزامەوە.. ئیدی بە هەر حاڵی هەبوو مامەم و مامۆژنم بەبەرمدا کەوتن، بە دڵدانەوە هێوریان کردمەوە داسەکنام..بێگومان ئەگەر ئەم دوو زاتە وەکو فریشتەی فریاد ڕەس یارمەتیان نەدابام.! مسۆگەر شێت دەبووم. لەو حاڵەتانەدا شێت بوون و خۆ لە بیرکردن گەلێك خۆشترە لەوەی هیچت لە دەست نێت. پاشان خەزورم بۆی گێڕامەوە : (کوڕم کە ملازم هیوا بریندار بوو، برینەکەی زۆر سەخت و کاریگەر بوو،زۆری خوێن لەبەر ڕۆیشتبوو،لە زمان کەوتبوو، چاوی هەڵنەدێنا، هەتا گەیاندبوویانە نەخۆشخانەی سەربازی، دە ڕۆژان بە شەو بە ڕۆژ دەرگای نەخۆشخانەمان بەر

نەدا، هەولّی دەدا چاوی هەڵێنێ . بەلاّم پێڵووەکانی سست ببوون دەکەوتنەوە سەر یەکدی، دوا جار شەوێکیان بۆ هەتا هەتایە مالّی خۆی لە گەڵماندا کرد، بەلاّم هەرچی زینۆ بوو، پێشتر کەمێك نەساخ بوو، کەچی کاتێ کە هەوالّی بریندار بوونی جگەر گۆشەکەی پێگەیی.! لە پەلو پۆ کەوت. کەوتە ناو جێ ڕاست نەبۆوە، سێ ڕۆژ دوای پرسەو سەرەخۆشی جوانە مەرگ، ئەویش سەری نایەوە چووە بەرڕەحمەتی یەزدان. ئیتر چارەنووس ئەوهابوو، مرۆ چی لە چارەیدا نووسرابێ هەرئەوەیە ڕەتناکرێتەوە، کوڕەکەم. دەبێ ئارامت بێ، خودا سێبووریت بدات).

## بەشی بیست و هەشت

دوو مانگی ڕەبەق خووم بەوە گرتبوو. لسبەینان زوو هەڵدەستام هەیپام لێدەکرد بۆ گۆڕستان دوای ڕێ و ڕەسمی ئایینی و دەستوری گۆڕستان. دواتر هەتا شلو کوت دەبووم دەگریام و دەکڕوزامەوە. هیلاك دەبووم بڕستم لەبەر دەبڕا، فرمێسکی چاوم چکی دەکرد ئاوی تیادا نەدەما هێندە دەگریام، پاشان لە نێوان گلکۆی هەردوو ئازیزان دا لە سەرچاو ڕادەکشام، تاکو دەمەدەمی نوێژی نیوەڕۆ، پاشان یاغر یاغر بە سستەڕۆو شلوخاوی بەرەو ماڵ دەبوومەوە.هەندێ جاریش کە بیرم لەقسەو نامەکانی ملازم هیوا دەکردەوە.!! (باوکە ئێوە بە دوای قەلقەلاشکی بابردوودا ڕادەکەن) شادەماری ڕق و کینەم جووت دەبوو کەللەی دەگرتم، هەتا لە خۆم وەڕس دەبووم هەرچی قسەی ناشیرین بوودەهاتە سەر زمانم نەمدەگێڕایەوە، هەتای دڵم دادەکەوت سارد دەبومەوە. دەڕۆیشتم. هەستم پێ کردبوو خەزوورم بەم خووەم دڵ گران بوو،لابەلا، سەرزەنشتی دەکردم. لە شەرمان دەبوومە یەك تنۆکە ئاو دادەچۆڕام . نەمدەزانی چیبکەم.؟! دەستم هیچ کارێکی نەدەگرت. شەوان سەرباری خەم و پەژارەیی خۆم بەزۆری بیرم لەم سەر زەنشتییەی خەزورم دەکردەوە. لەناخەوەبریندار ی دەکردم. دواجار بڕیارم دا شاری زینۆخان و جوانە مەرگ

جێ بهێڵم. ڕۆژێکیان سەری خۆم هەڵگرت لێرە لەم شارەدا گیرسامەوە .ئیتر وادەمبینی مەمرەو مەژی بە جگەرە فرۆتنی سەر شۆستە دەیقەتێنم. .ناوە ناوە هەندێك پارەلە دەمی خۆم پاشەکەوت دەکەم.هەیپای لێدەکەم بە سواری ئوتومبێل دەچمەسەردان و سۆراخی دایك و باوکی زینۆ، پێنج، شەش، شەوان لە خزمەتیان دەمێنمەوە. باروبوویان دەکەم، چونکە خەزورم تووشی نەخۆشی (باداری) بووە لە کار کەوتووە، ئەوەی لە خۆم زیادبێ لەدەستی خەسووم دەنێم، نایدەمە دەست خەزورم. چونکە دەزانم بە سەرەخۆیدا دەشکێتەوە، سووێی لە خۆی دەبێتەوە. هەستی بریندار

ناکەم، چونکە خۆشم دەویّ، ئەم چەند ڕۆژەی لە لایان دەمێنمەوە،بە ڕۆژ دەچمە سەر قەبران، لە ناو شورەی مەزارو گلکۆی خۆشەویستان دا هەندێك چلە نەمام و گوڵم چاندووە، هێدی هێدی ژێریان شل دەکەمەوە. ئاویان لە بن دەکەم، خۆمن دەزانم ئەوەی یەکجارەکی ماڵئاوایمان لێدەکات تەواو ئیتر جارێکی نایبینینەوە.بەلاّم من بەم نەمام چاندن وئاودان و بژارکردنەوە دلّم پیّ خۆش دەبیّ، دلّم دادەکەویّ ..(هێشتا قسەی تەواو نەکردبوو، هەناسەکی ساردی هەڵکێشا، هەروەك شتێکی و بیرهاتبێتەوە.یان بیرلە شتێکی دیکە بکاتەوە، نازانم چی بوو.! مڕدامابوو، جگەرەیەکی بە دەستەوە بوو بەر لەوەی تەواوی بکات بێتە سوتوو، هەر بەو جگەرەی دەستی جگەرەیەکی دیکەی داگیرساند) دواتر پێدا چوونیارۆ بەلاتەوە سەیر نەبیّ.! من وەکو گندۆرەی گەیی بەر خۆرەتاو هەر لە جێوە لەق بووبیّ، من بە هەمان شێوە هەناوم بەناوەوە دا بەربوویتەوە،خۆم دەزانم ژیانم بەندە بەم چوڕە(سپی)یەی کە هێواران فڕی دەکەم : هەزار ڕەحمەت لە دایك و باوکو مردووی ئەو وەستایەبیّ کە ئارەقی دروستکردووە، سالانی زوو گالتەم بەم کەسانە دەهات ئەوانەی (مەی) یان دەخواردەوە. بەلاّم ئێستاکیّ نەخێر، چونکی پێکەوتم بۆ چی..؟! ئەوانەکڕنوش بۆ جامی مەی دەبەن.(هەستم پیّ کرد لەم ئانەدا زەردەخەنێکی خەماوی باریك بەسەر قەیتانی لێوی دا هات)

پاشان گوتی: دەڵێن: پێبکەنە دنیا لە گەڵت پیّ دەکەنیّ، باشە. من بەچی دلّم خۆشبێت،؟! تاکو پێبکەنم. بۆ کیّ و بەچی پێبکەنم .؟! مرۆ. ئەگەر لە ناخەوە پێنەکەنی یانی چی.؟! منێکی بیّ ئومێدو هیوا بڕاو لە ژیان بەچی پێبکەنم.؟! ئەرباب، ئەوە ژیان نییە، ژیانێکەلێوان لێوە لە خەم و خەفەت و ئیشو ئازارو مەینەت، ئەوە هەمووی ژەهری کۆلەوارییە ئێستاکیّ هەڵیدەگرمەوە، گشتی لە نێوچەوانی دەرەبەگایەتی یەوە بوو ڕۆژم بەم ڕۆژەگەیی، ئەگەر لە گوندەکەی خۆم بام.! ئێستا خاوەنی زەوی و زارو مەڕو مالات وجووتە هێستری خۆم بووم، بەلاّم مرۆ قسەیەکی خێریش بۆ گورگ بکات.هەندێك لە بنەماڵەو خانەوادەی ئاغای گوندەکان.قوتابخانەیان لە گوندەکانی خۆیان دەکردەوە،بە زۆری وزۆدارەکی دەبوایە مندالانی ئاوایی بچنە قوتابخانەو بخوێنن.هەڵبەتە مێژوو هەڵوێستی ئەم خانەوادانە

فەرامۆش ناکات. .بەلآم تۆبلێچ دەکەی لەگەڵ ئینسانی نەگریس وهەڵپەرست وبەدڕەوشت ونەفس نزم و چرووك.!

ئەی بۆچی دەڵێن ناکەس بەچە.

ئەدی هەر ئەم ناکەس بە چەو تڕۆو هەڵپەرستانە نەبوون کارێکی وایان بەم میللەتە کوردە هەژارە ئاشتیخوازە کرد لە سەر خاکو نیشتمای خۆی.با. .بە دەواری شڕی نەکردووە،کردیانە ئاردی ناو دڕکان. .بەلآم ئەم هەرچی و پەرچی و دەبەنگانە زۆر چاك بزانن.!

ئەو ئاردەی ناو دڕکان لە بەهارێکی تردا لە نووکەوە سەوزەبێتەوە، چمە.! دنیا هەر ئەوها بێ باران و هیشکە ساڵ و بێ بەهار دەبێ.؟لیارۆ. لواتێمەگە کەمن لەکردەوەکانی ڕابردووی خۆم پەشیمان بم. نەخێر هەرگیز پەشیمان نیم و پەشیمان نابمەوە.بەلآم خەم و کەسەرو ناڵەناڵی ئەوەم.!

لەسەرەمەرگدا نەمتوانی یارمەتی زینۆخان بدەم، بەوەی کە تۆزێك لە ئێش و ئازارەکانی کەم بکەمەوە لە دیار سەری دانیشتبام دوو فرمێسکی گەرمم بۆی هەڵڕشتبایە،چونکە دڵنیام لە کاتی سەرە مەرگدا هەرلە چاوەڕوانی دا بووە.ئەم خەمەیە بوویتە بارێکی قورس و گران لە سەر شانم، بەعەجەمەرگی بەرانگژم بوویتەوە. دەیەوێ ڕەزیل و سەفیلم بکات دواتر دەست بنێتە خنخنۆکم بم خنکێنێ بەلآم هێشتا هەر لێی بێ منەتم. کەی دێ بۆ ڕۆح کێشانم بابێ. چونکی لەم دنیایەدا فلسێك چییە.؟! قەرداری کەسێك نیم. . هەتا ئەو ڕۆژەی سەر دەنێمەوە منەتباری خەڵکی حەسارێم، چونکی ئەو ڕۆژەی کە زینۆخانم گواستەوە زەماوەندمان گێڕا. هەر من خۆم دەزانم چیان بۆ کردم، خوشك وبرا، بۆ برای ناکات، ئای. . کە چەند سپڵەو بێ وەفاو حەرامزادەو بێ نمەك بووم بەرامبەر بە ئاسیا.! ئاسیا بۆ من فریشتەی فریادڕەس بوو، کەی تەنگاوبام، پشیم سوار دەبوو ناوی خۆم لە بیر دەکرد، ئاسیا وەکو خدری زیندە پەیدا دەبوو. دەستباری دەگرتم، بە قسەی خۆش و گاڵتەو گەپ و فشقیات هێوری دەکردمەوە، دەیبردمە دنیایەکی دیکە، دنیایەکی گەورەو فرەوان بە دوور لە خەم و پەژارە.

ئاخ خ. .کە بیر لە ڕۆژگاری ڕابردوو دەکەمەوە هەناوم کزەی لێوە دێ. یادی

بچکۆڵ و قالەبەراز دەکەمەوە، یادی هاوسەنگەرو پێشمەرگەکان و بەزم ورەزمی شەوانی بارەگا دەکەمەوە،هەرگیز لە یادم دەرناچن، بەدەستە خۆم نییە،

جاری وایە دڵم وەکو کورەی ئاسنگەر دێتە جۆش. مەگەر بە فرمێسکی چاوەکانم ساردی بکەمەوە، خۆزگە نەمردبام..! تاکو بۆ دواجار بە دیداری ئەو کورە وەفادارانەی هاوسەنگەرم شاد دەبومەوە، ئەوجا مردن حەق بوو پێشوازی لێدەکەم خۆ من دەزانم هەردەمرم، بەلاّم سوێندم بەزام و برین وخوێنی شەهیدان. باکم بە مردن نییە، ئەسڵەن هەر لێی ناترسم، بە خەیاڵم دا نایەت. ئاخۆ هەیە یان نییە.؟! چونکە مردن سوننەتی ژیانە،چارەنووس ئەو هایە.! دەستەوەستان لەحزور بەزەیی ومیهرەبانی پەروەدگاردا ڕابوەستم، ئەگەر بێ نەزاکەتی نەبێ بەرامبەر بە یەزدانی مەزن، لەو ڕۆژەش ناترسم ترسم نیە، بۆچی بترسم.؟! ناترسم. چونکە خیانەتم لەگەڵ دایکی مەزن و نەتەوەو گەلەکەم نەکردووە، بۆیە ناترسم. ئێستا هیوادارم دەمراست و برا گەورەکانی میللەتەکەم چیتر بەدەنگی دەهۆڵی بێگانە هەڵنەپەڕن، هەموو هەنگاوێکیان لە پێناوی ڕزگاریی و سەربەخۆیی و ئاوەدانکرنەوەی کوردستان بێ، بۆ ساڕێژکردنەوەی زام و برینەکان بێ، چونکی هەروەکو دەڵێن (بێگانە یەك مەیدانە)بێگانە بەدەردی(حاجی و مەلا و سەید)تان دەبەن. ئەوە بەسەرهاتێکی زۆر کۆنە، ئەوەی نەی بیستوە،یان نایزانێ. با لە ڕیش چەرمووەکانی خۆیان بپرسن.خۆزگەمە.لە خودای تاکو تەنهای میهرەبان. لێی دەپاڕێمەوە جارێ نەمرم، هەتا ئەو ڕۆژەی بە چاوی خۆم دەبینم.! شارو شارۆچکەو گوندەکاولبووەکان ئاوەدان دەکرێنەوە. ئالاّی ولاّتەکەم لە سەربانیژەی گوندو تەلاری شارەکاندا دەشەکێتەوە..چۆماڵی جۆگاو کانیاوەکان دەکەن. جارێکی تر.(ترێ)ی ڕەشمیری و هەناری نازەنین و شارەبان. شاتووی شەقلاّوە دوکانی میوە فرۆشانی شار دەرازێننەوە.کۆچەریەکان بە مێگەل گیسك و کاوەڕە نێر دەنێرنە بەر قەنارەی قەساب، بەلکوله(ڕۆستی نێکسپایەرو گۆشتی کەنغەرو گۆشتی پیرە گاو گامێشی هیندی) ڕزگارمان دەبوو..هەنگێ بە هەق مردن هەق بوو، پاشان بە بەختەوەری لە باوەش دایکی مەزن لێ ڕادەکشام، هەتا ڕۆژی (ڕابوون)و حیساب. خەونی خۆش خۆشم بەزینۆخانەوە دەدیت.

# بەشی بیست و نۆ

(هێشتا دڵی دانەکەوتبوو.دڵی بەوە خۆش بوو.! من بە تاسووقەوە گوێ بۆ ئاخافتن و بەسەرهاتەکانی ڕادەدێرم. بۆیە حەزی دەکرد ئەوەی لە هەگبیەیدامابوو لە بەردەمم دا هەڵیبڕێژێ بەڵکو دڵی دادەکەوت).

دوا جار تێهەڵچووە گوتی: من دەزانم لە ڕۆژی هەستانەوە(قیامەت)دا پەروەردگار لە خوێنی (ملازم هیوا) وەکو بکوژ لێپێچانەوەم لەگەڵ دا دەکات.وەنەبێ نەزانم، بەڵێ دادگایم دەکات. بەڵام تۆ بڵێ: ئایا لە پای خوێنی ملازم هیوا سزام دەدات .؟! نەخێر.

چونکە خودای گەورەو میهرەبان لەم ڕۆژەدا لە کەسانی وەکو ملازم هیوا ئاسای. تورەیە هەرگیز نایاندوێنی، چونکی ئەوانەی لە پێناوی هەندێك دەستکەوتی قەڵپ و بێ قیمەت و تروهات، خیانەتیان لە گەڵ دایکو باوك و گەڵ و نیشتمانەکەیان کردووە، بۆیە دڵنیام.! کە خودای بەخشندە و میهرەبان، چۆن نایاندوێنێ، هەروەنایانبەخشێ، چونکی خیانەتکاری هاوتای (زینا)یە، زیناش لە گەڵ کێ.؟! لەگەڵ هاوخوێن و نیشتمانی دایك. ئیتر چاوەڕانی چی لەم مرۆڤە دەکەی کەلە دایکی خۆی ناپەنگێتەوە.؟!

جیاوازی چییە لەگەڵ چوار پێی پووشخۆر و جوانەگای ناو گاران.؟! ئەو خۆفرۆشانە چووزانن ڕزگاریی و سەربەخۆیی سەروەریی نیشتمان یانی چی.؟! یارۆ. ئەوانە مۆرانەن. گۆردەن، ئەو گۆردانە هەرگیزمافی ژیان و لێخۆشبوونیان نیە، دەبێ بکوژرێن، ئەسڵەن شایانی ئەوەن.! لەناو ئاودەستخانەکان دا سەریان پانبکرێتەوەو، تور هەڵدرێنە ناو زبڵخانەی گەل. چونکی دڵنیام خاکی نیشتمان بە خۆیان ناگرێ. بەڵێ یارۆ . ئەگەر بە تەمای ئاڵای سەروەری نەتەوە لەسەر خاکی پیرۆزی وەتەن هەڵدەی بشەکێتەوە.! دەبێ لە پێشدان جگەر گۆشەکەی خۆت و خائین و خۆفرۆشانی هاو خوێن و هاونەژاد لە ناو ناو دەستخانەکان دا بە دۆزەخیان بسپێری، دواتر حیسابێك بۆ دوژمنان بە گەل ونیشتمان بکەی.

(کۆتایی)

تەرحیل و هیشکەسالی لێکیان گرێدابۆوە. بازرگانی (کەپەک) بەهەرمێن کەوتبوو، وایلێهاتبوو هەرچی باشبازرگان و کوتاڵفرۆش و ئاغاو بەگلەر و پیاو ماقوڵ و بەچکە شێخ و خاوەن تەکیەو کاربەدەستانی دەوڵەت و ئافرەتی مەچەک پڕ لە بازنی زێڕو ...

ئافرەتی وا دەهات بۆ وەرگرتنی کەپەک، بزن و تەگەی لێك جیا نەدەکردەوە. کەچی کارتێکی بەدەستەوە بوو، 10تەن کەپەکی تیادا نووسرابوو.. چییە ؟!

کەپەك قیمەت دەکات.